نووسینی کەریمی حیسامی

# بادانەوە

ناوەندی چاپ و رازاندنەوەی مەنسوور

# بادانەوە

بادانەوە وشەیەکی رەوان و پاراو و ناسراوی کوردەواریە. گەلێ جار لە شوێنی جیاواز و بۆ کارو مەبەستی جیاواز بەکار دەهێنرێ. ئەم وتەیە ئەوەندە باوە و لە زاران خۆشە، تەنانەت رەشە ولاغیش تێی دەگات و کە گوێی لێبوو، بادەداتەوە. ئەوەتا کاکی جوتیاری کورد لە سەری هۆگانی جوتی، دەنگی گاجوتەکانی دەداو دەڵێ: هۆ.. وەرەوە سەرخەتێ... بادەوە لە عەمرمت کەوێ..

گاجوتی بەستە زمان بە گاوەخۆ بادەدەنەوە و دێنەوە سەر خەتێ. سەردەمێکی کە هێشتا ترومبیل نە هاتبوونە کوردستان، ئەسپ سواری فرە باو بوو. سوار چاك و شۆرە سواری کورد، ئەسپیان وەها تەعلیم دەدا کە لە سەری مەیدانێ هەر بە خۆلار کردنەوەی سوار و بە رانی رکێفێ بایدەداوە. دیارە بادانەوەی ئەسپ و گاجوت چ زیانیان بۆ خاوەنەکەیان نەبوە و گوێ رادێر و بە فەرمانی ئەو بایانداوەتەوە.

لە گەڵ پەرە گرتن و گەشە کردنی پێوەندیەکانی کۆمەڵ، دیارە بادانەوە بۆتە داب و ئامرازێکی نێو ئادەمیزادان و لە ناوچەی جیاواز بە شێوەی جۆر بە جۆر کەلکی لێ وەرگیراوە. لە باری زمانیشەوە دەولەمەند بوە. وەك: بادانەوە... باوەدان... گەرانەوە... وەگەریان.. زڤرین... پەشیوان بوونەوە، وەرسوران، سورانەوە، وەرچەرخان و..هتد.

لەوانەیە لە کوردەواریدا بادانەوە مێژو ورابردوییکی هەبێ. دەڵێن کاتێك حکومەتی عەجەم بە شەر و دوژمنایەتی دەروستی هەمزاغای مەنگور نەهاتوە، لە ریگای فێڵ و فریودانەوە بۆ لە ناو بردنی کەوتۆتە کار. حەسەنعەلیخانی گەروس (ئەمیر نیزام) کە خۆشی کورد بوە، کراوە بە حاکمی سابلاخ. ئەویش هەمزاغای داوەت کردوە بۆ

سابلاخێ و سوێندی بۆ خواردوە و پشتی قورعانی بۆ ئیمزا کردوە کە بێتە سابلاخ و خەیانەتی پێناکات• هەمزاغا بە سوێندو قورعانی کابرا باوەری کردوە و بەرەو سابلاخ کەوتوتە رێ• کە لە بستوێ گلە سپی هەمزاوایە بە دیوی پشتەپیدا سەر دەکەوێ، پیرە پیاوێکی مەنگور لەوێ جوتی دەکا• کە چاوی بە هەمزاغا دەکەوی کە وا بۆ سابلاخ دەچێ بێ ئەوەی بگاتە سەری هوگانێ هەرا دەکا : " هۆ•• باوەدە کەلی سوور بە قوربانت بم بادەوە ••• سوورە وەگەرێ •• هۆ ••• باوەدە " نەجارێك و نە دوو جار• بادەوەی کابرا هەمزاغا وەشك دەخات و بە پیاوەکانی دەلێ : ئەو کابرایە چ گای سووری لە بن نیریدا نیە، ئەو باوەدە باوەدەی لە چیە ؟ رکێف لە ئەسپی دەداو دەچێتە کن کاکی جوتیار• ماندوو نەبوونی لێدەکاو دەلێ: " تۆ چ گای سوورت پێ نینە جوتیان پێ بکەی ، ئەو هەموو باوەدەو و وەگەریەت لە چیە ؟• کابرا دەلێ : " گورە دەلێم لە گەلّ تومە • باوەدە • چۆن بە پێی خۆت دەچیە بەر دەستی عەجەمان • وەگەرێ دەتکوژن • عەجەم ئیدە بە- قایە نین • باوەدە •• " هەمزاغا دەلێ : تازە هاتوم و بانادەمەوە • باناداتەوە و دەچێ و دەکوژرێ • ١

بادانەوە لە نێو عەشیرەتاندا زۆر باو بوە • مەزن و سەرۆك عە- شیرەت زۆر جار ناکۆکیان کەوتوتە نێو • قولە ئاغاکان هەر جارە لای سەرۆك عەشیرەتێکیان گرتوە• بەلام لە پر لەو زویر بوون و بایان داوەتەوە بۆ لای ئەویتر• قولە ئاغای وام پێ شك دێت، لە نێو مامە- شان کە سالێ یەك دووجار لە نێوان پەسوە و جەلدیاندا ئەم بەرەو- بەریان بوە و بایانداوەتەوە•

ئەم مەسەلەیە کە دەلێن : (لە نێو مەنگوران بادانەوە عەیب نیە) هەر لەوەرا هاتبێ• ئەوەندەیان بادابێتەوە و ئەم بەرەوبەر کرد بێ ئیتر عەیبە هەلگیرابێ•یا بە لێنیان بە یەکتر دابێ و پەژیوان بو-

١-مام وەتمانە سوری دیبوکری کە گەورە نوکەری بایز پاشابوگێراویەتەوە

بووبنەوە٠ مامەنداغای پیران کە بە سوارچاکی و ئەنگێوەیی و نان بدەیی بە ناوبانگ بوو، ئەگەر قسێکی دەکردو نەیدەبردە سـەر دەیگوت : " قسەی خۆم هاتەوە کنە خۆ"٠

(دەڵێن لە سابڵاخ فەقێ یەك لە مزگەوتی سوور لە خزمەت ماموستا مەلا عبدالرحمان خوێندوویەو لە ئاخری ماددان بوە کە بێبێتە مەلا٠ رۆژێك بە ماموستای گوتوە : " قوربان ئێرەم پێخۆش نیە و دەمـەوێ بڕۆم "٠ ڕۆیشتوە ٠ پاش دوو ساڵ هاتۆتەوە مزگەوتی سوور، بەلام لـە دەرسەکانی گەراوەتەوە دوایە ٠ ماموستا دەرسی پێگوتوە و پـاش ساڵێك دیسان ڕۆیشتوە٠ ماوەیەکی زۆری پێچوە ، فەقێ سەرلـە نوێ بایداوەتەوە و هاتۆتەوە خزمەت ماموستا ٠ بەڵام ئەمجارە گەراوەتەوە بۆ (جامی و سیوطی)٠ ماموستا مەلا رەحمان دەڵێ :" بابەڵێ ،وەك تۆ وا پاشەو پاش دەگەرێیەوە بۆ دوایە ، بە دوو ساڵی تر دەچیەوە دە هینی دایکت "٠)

بادانەوە هەروا لە نێو عاشیرەت و خەڵکی سادەو رەشۆکیدا نـە وێستاوە٠هەر لە کوردستانیشدا قەتیس نەبوە ٠ وەك تولەکە رەگاژۆیی کردوە، پەلی هاویشتوە، سنوری پەراندوەو خۆی گەیاندۆتە نێو کەسانی سیاسی و روناکبیرو خوێندەوارو دیپلۆمات و ٠٠٠هتد٠

ئەوەی مەنکوری نەخوێندەوارو سادەو دڵپاك گوتویانە " بادانـەوە عەیب نیە " ئێستا وەراست گەراوە و بۆتە رەوشت و کاراکتیری ـ گەلێك گەورە پیاوی سیاسی و سەرۆك دەوڵەت و رووناکبیرو شاعیرو نووسەرو ٠٠٠ هتد٠ ئیتر بۆتە باو ٠ هێندێ کەس بە سیاسەتی دەزانێ هێندێ بە ژیری و روشدی فیکری ناو دەبەن ٠دەستەیەك بە گۆرانـی بیرو باوەری دادەنێن٠ هێندێ بە هەلپەرستی دەدەنە قەڵەم ٠ بەڵام کەس گوێ ناداتە ئەم قسە و تەعبیرانە ٠ ئی واهەن بە جارێك بادانـەوە واز ناهێنن، ئەمبەرەوبەریشی لێ زیاد دەکەن و ئارەقەش ناکـەن و تەریقیش نابنەوە ٠

بادانەوە بۆتە بەشێك لە چالاکی خەڵکێکی زۆری ئەم سەر دەمە. لە سیاسەت بە کاری دێنن ، لە سەوداو مامڵەدا کەلکی لێ وەر دەگرن، لە دۆستایەتی و هاوکاریدا بە ڕێوەی دەبەن. وەختە بێژم لە دنیای ئێمرۆدا لە هەموو شت بە برەو ترە .

بادانەوە باسێکی فرە قوڵ و بەر بڵاوە.بیروراو بۆچوونی جیاوازی لە سەرە . شیکردنەوەی خەست وبابەتی بادانەوە پێویستی بە دوکو- مێنت و بەڵگەی تەواو هەیە. لێرەدا دەمەوێ بە کورتی و بە گوێرەی توانا هێندێ لایەنی بادانەوەی دەوڵەت و پیاوە سیاسیەکانی جیهانی و ئەنجامی بادانەومیان بێنمە سەر کاغەز و پاشان ئاورێك وەسەر بادانەوە بدەم لە کۆمەڵی کوردەواریدا . لە بەر ئەوەی باسەکەم لە کوردستانەوە دەستپێکرد بوو ، دەبوایە هەر لە کوردستانیشەوە پێدا بێم بەڵام بە گوێرەی برەوی بادانەوە، ئەوا خۆشم بادەدەمەوە بۆ سەر باسی بادانەوە لە وڵاتانی دیکەو پاشانیش دیسا ن بادەدەمەوە بۆ سەر کوردو کوردستانەکەم .

با لە پێشدا ئەوەش بڵێم کە وەنەبێ بادانەوە هەمیشە هەر باری مەنفي و ناپەسندی هەیە و لە هەموو کات و هەل و مەرجێکدا هەر بە چەوت دادەنرێ. جاری واهەیە بادانەوە نیعمەتی خودایە و بە قازانجە هێندێ جار زیانی هەیە . جاری واهەیە غیرەت و ئازایەتی گەرەکە. هێندێ جار بۆ فێڵ و تەڵەکە بە کار دێت. واش هەیە ربسوایی و ئابرو چوونی بەدواوەیە . بە کورتی هەویرێکە ئاو زۆر هەڵدەگرێ. ئەوەندەی خودا حەز بکا دەکرێ دەستاو دەستی پێبکەی، لێکی دەیەوە و بیشێلی.پێویستە لە کات و بارودۆخی خۆیدا داوەری لە سەر بکرێ و بە شێوەی ڕەمەکی ئەم وشە ڕەوان و پاراوە لێك نەدرێتەوە.

منیش بە گوێرەی تێگە و بۆچوونی خۆم دەگژی ڕاچوم و لەوانەیە چاکیشی بۆ نەچوبم و ئامانجم نە پێکا بێ و بە دڵی زۆر کەسیش نە بێ، بەڵام بێگومان بۆ خوێنەری کورد بێ نرخ نیە .

# بادانەوە لە هەمبەر مەسەلەی کورد

وتمان بادانەوە با سێکی فرە بەر بڵاو و هەویرێکە زۆر ئاو هەڵدە-
گرێ. بۆیە دەمەوێ بەکورتی باسی ئەوانە بکەم کە لە سەرەتای سەدەی
بیستەمەوە لە پێوەندی لە گەڵ مەسەلەی کورد، بایانداوەتەوە.

وەك دەزانین یێکەم بادانەوە کە خەیانەتێکی بەر چاو بوو بە کورد
پەژیوان بوونەوەی رێکخراوی (لاوانی تورکیا) بوو لە قەول و بەڵێنی
کە بە کوردیان دابوو. هەر وەها بادانەوەی کەمالیستەکان لە بریار و
بەڵێنی (پەیمان نامەی نیشتمانی) کە لە ژلنویەی ۱۹۲۰ بە کوردیان دابو
کە دەبوایە ڕێز لە مافی کوردەکان بکرن.

بە دوای ئەودا بادانەوەی (کۆمەڵی نەتەوەکان) بووساڵی ۱۹۲۳ لە
کونکرەی لوزان کە بەندو بریارەکانی پەیمانی سیڤر یان خستە ژێر
پێ و بەرەو حکومەتی تورك و پێشێلکردنی مافی رەوای کورد بایاندا وە.
دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان بە شێواندنی مەسەلەی موسڵ و لکاندنی
کوردستانی خوارو بە عیراقەوە، لە هەموو یاسا و رەوشتێکی مرۆڤایە-
تی و دادپەروەری بە زیانی کورد بایانداوە.

خۆ لەم کورتە نووسینەدا دەرەتانی ئەوە نیە کە بادانەوەی ئینگلیز
لە دانی سەربەخۆیی بە کوردستان و لێدانی حکومەتی شێخ مەحمود
روونبکرێتەوە کە تا ئێستاش زامی ئەم وەرگەران و بادانەوەیە لە
جەستەی کوردو کوردستاندا هەر دیارەو ساریێژ نەبوە. ئەم باسە
زۆریشی لە سەر نووسراوە.

بادانەوەی ستالین لە بریارو فەرمانەکانی لینین لە مەر هەریمی
خود موختاری بۆ کوردەکان و هەڵوەشاندنەوەی ناوچەی خود موختاری

و دوور خستنەوەو بلاو کردنی کوردەکان یەکێك لەو کۆمەڵە جینایەتا نەیە کە لە زەمانی ستالین دا کراون. یان هەڵوێستی حکومەتی سوڤیەت لە پێوەندی لە گەڵ راپەرینی کوردەکان لە ئەرارات، دەچێتە ریزی ئەم هەنگاوانە کە بۆ پێشێلکردنی یاسای مرۆڤایەتی و ئوسوڵی ئینترناسیونالیزم کە تەبلیغاتی پێوە دەکرا ، هاویژراوە.

بادانەوەی سۆڤیەت لە پشتگری بزوتنەوەی کوردستان و ئازربایجان وێلکردنیان لە بەرامبەر هێرشی حکومەتی ئێراندا.

بادانەوەی قەوام السلطنە لە بەڵێن و پەیمان لە گەڵ حکومەتی میللی ئازربایجان و کوردستان.

گردەوەی پر لە شەرم و شورەیی بادانەوەی سەددام حوسین بوو، بۆ پەیمانی ئەلجەزایر. ئەم کابرا روشەڵ و (رەفتار فاشیستە) ! سەرەرای هەرەشەو جنێو وپێکهێنانی کونفرانس و کۆبونەوە ، ئاخرەکەی لە ئەلجەزایر دەستی کردە ملی شای ئێران و لە سەر حیسابی شۆرشی کورد ملی بۆ ئیران حیز کرد ولە هەموو ئیدیعایەکی یەکاوی عەرەبان و دورگەی ئەبو موساو تونبی گەورەو پچوك بایداوەو پاشگەز بووە.

لەوی بێ ئابروانەتر بادانەوەی شای ئیران بوو لە پشتگری بزووتنەوەی کوردستانی خوارو. ئەو کابرا دیکتاتور و ترسنۆکە بزووتنەوەی کوردی هانداو یارمەتیدا تا ئەو کاتەی حکومەتی عیراقی پێ بە چۆك داهێنا و ویستەکانی خۆی بەسەردا سەپاند. پاشان کوتو پر لەو پەری نامەردیدا بایداوەو هەموو یارمەتی و رێگایەکی لێ بریو شۆرشێکی چاردە ساڵەی پر لە فیداکاری و قارەمانەتی بەم دەردە برد کە هەموومان دەیزانین.

خۆ ئەگەر بادانەوەی کیسنجیر وەزیری دەرەوەی وەختی ئەمریکا لە بەڵێن و قەول و قەرارەکانی بە شورشی کورد لە بەر چاو بگرین ، بە قەولی رۆژنامە نووسێکی ئەمریکایی ئەوا دەبێ وەك پەڵمیەکی

١ ــ ئیستلاحی مام جەلالە لە وتاریکی خویدا لە ئوتریش.

ڕەشی تەماشا بکەین کە هەتا هەتایە لە سەر لاپەڕەکانی مێژووی جنا-
یەتی ئەمریکادا دەمێنێتەوە •

بادانەوەی ئاواش هەیە کە بادەرەوە سەری تێدا چوە • سادات سەر
کۆماری میسر لە سەر بادانەوە سەری تێدا چوو• ناوبراو بۆ ئەوەی
خاکی داگیر کراو لە ئیسرائیل وەرگرێتەوە، پشتی دەعەرەبان کرد و
بایداوە بۆ لای ئیسرائیل • پیاو هەق بلێ بادانەوەی سادات ئـــەو
پەری ئازایەتی بوو• چەند ساڵێك عەرەبان لێیان لە هەڵادا ، بەلام ــ
ئاخرەکەی گشتیان بایانداوە بۆلای میسر و ساداتیش بۆی دەرچوو•

خۆ ئەگەر سەیرێکی بادانەوەو پاشگەز بوونەوەی خومەینی بکەین
کەخۆی بە ئیمام و وەلی و نوێنەری خوداو بە موسلمان دەزانی ، ئـــەوا
دەبێ هەزار ڕەحمەت . بۆ ناموسلمان بنێرین • خومەینی بەر لە هەموو
شت لەو هەموو بەڵێن و وادەو فەرمایشاتە بایداوە کە بەر لـــــــە
گەڕانەوەی بە خەڵکی دابوو• خومەینی بە فتوای خەزا دژی کورد لە
گشت یاساو ئوسولێ ئینسانی بایداوە • دوای شەری سێمانگەو شپرزە
یی ئەرتەش و پاسدارانی غەیرە ئیسلامی ،ئەمجار بۆ فریودان و خــۆ
کۆ کردنەوە، بەم لایەدا بایداوە و ڕایگەیاند کە ویستی کوردەکان ئەشێ
بسەلمێندرێ• پاش خۆ کۆکردنەوەو فریو دانی هێزە چەپەکانی ئیرانی
جارێکی دیکەش بایداوە سەر کوردستان و فتوای قتل عامی کـــوردی
زیندوو کردەوە• زۆری پێ نەچوو ئەمجارە بایداوە سەر ئەم هێزانەش
کە ڕاویان بۆ دەکرد و بە زیدی ئیمپریالیستیان دەزانی•

خومەینی نیزیکەی هەشت ساڵە سەر درێژەی شەر پێی چەقاند تا
میلیونێکی خەڵك بە کوشت داو ئیرانی وێرانکرد• پاشان بە ناچاری
و بە سەر شۆری بە خواردنەوەی پیاڵەی ژاربایداوەو بە شەرمەزاری ئەو
هەموو جنایەت و تاوانەی لە گەڵ خۆی بردە خزمەت باریتەعالا کـــە
وەك نوێنەری ئەو لە سەر زەوی ئەنجامی دابوون •

# بادانەوەی ئازایانە

لە مەیدانی جیهانی و لە بواری تاکی دەوڵەتاندا، بە لای منەوە لە بادانەوەی گورباچوف ئازایانەترو مێژوویبیترو دەنگدەرەوە تـــر نەبوە • هەروەك شورشی ئوکتوبر لە رووسیا دنیای شلەژاند، بادانە- وەی گورباچوفیش دنیای توشی رامان و گۆران و سەر سورمانکـــرد• شورشی ئوکتوبر تاقە وڵاتێکی گۆری و زۆر درنگ کاری کردە ســەر رەوتی دنیای دەرەوەی روسیا• بەلام بادانەوەی گورباچوف نەك هــەر وڵاتەکەی خۆی، بەڵکو سیستمێکی جیهانی لە بەر یەك هەڵتەکانــد• چەند وڵاتی ئوروپای روژ هەلاتی لە بنە رەتەوە ژێرو ژور کرد•

دنیای سەرمایەداری تووشی رامان و بیر کردنەوە ی تازە کرد• سنوری تێکدان و دیواری روخاندن•بۆ دەر برینی بیرو باوەرو بیر کردنەوەی نوێ رێگای کردەوە• دەرەتانی ئەوەی پێکهێنا کە میللەتان بتوانــن خۆیان چارە نوسی خۆیان دیاری بکەن•

ئیمرۆ تەواوی ئەوکەسانەی بەر لە بادانەوەی گورباچوف لە نــێو بەندو داوی حیزبایەتیدا قەتیس ببوون و ئێستاش بە ناوی جۆر بــە جۆری وەك؛وریا بوونەوەو نوێ بیر کردنەوە و روشدی فیکری و•• هتد زمانیان کراوەتەوەو بایانداوەتەوە، دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەن و ئێ واش هەن لە تێکۆشان و تەضانەت فیداکاری رابردووی خۆشیان شــەرم دەکەن و بوونە بلبلی هەزار داستان ، گشتیان دەیندداری بادانــەوەی گورباچوف ـ ن و زمانکردنەوەی خۆیان پێویستە لەو بزانن •

بادانەوەی گورباچوف رووداوێکی ئەوەندە گرنگو دنیا گرە، کــە گەلێك فیلسوف و سیاسی و ئابوری زان و کۆمەڵناسی بە خۆوە خەریك

کردوه و له روانگەی جۆر بە جۆرەوە سەیری دەکەن و لێکی دەدەنەوە.

بادانەوەی گورباچوف تا ئێستا نە بۆ وڵاتەکەی خۆی و نە بۆ کورد هیچ قازانجی نەبوە . ئەوەندە نەبێ ئەو قفڵەی جاران لە سەر لێوو زمانان بوو شکاندوویەو خەڵك دەتوانێ بە سەربەستی زمانی بگەرێو لە رابروو رەخنە بگرێ و کەموکوریەکانی ئێستا دەست نیشان بکا. ئەمە لە لایەك، بەڵام لایەکی دیکەشی ئەوەیە کە قەوارەی وڵاتەکەی ئەوا لە گریژەنە دەچێ و دیاریش نیە ئاکامی بە کوێ دەگات .

بادانەوەی گورباچوف لە بواری جیهانیدا تەئسیری دوولایەنـــەی هەبوە ،بۆ هێندێ وڵاتان خێرو بەرەکەت و بۆ زۆرانیش زیانی هەبوە. ئەوەتا ئەمریکای کردۆتە کەڵی گونی و وەك تاکە زلهێزی جیهان بێ لەمپەر و بەربەست لە دنیادا راو راوێن دەکا . وڵاتانی ئوروپای رۆژ- هەڵاتی وێڵکردوە ، ئەڵمانیای لەتکراوی پێکەوە لکاندۆتەوە ، ئەتیوـ پیای رەشی لە برسانمردووی لە چنگ دیکتاتوری دەستکردی خۆیـــان نەجات داوە و گەراوەتەوە باوەشی ( دنیای ئازاد ). لە ئەفغانستان هاتۆـ تە دەر و مەیدانی بۆ چەکی ئەمریکا و پارەی سعودی و زەلامی موجاـ هیدینی موسلمانی ئەفغانی سەر بە ئێران و پاکستان ، چۆڵکردوە . بەڵام لە لایەکی دیکەوە بۆ وڵاتانی دنیای سێیەم بادانەوەیەکی بـــە قازانج نەبوە . پێشتر وڵاتانی دنیای سێیەم دەیانتوانی لە نێوان دو زلهێزی جیهانیدا مانورێك بکەن و لەم یالەو کروکاشێك بکەن. تەنانەت جاروبار بە پشتیوانی یەك لەو دوو زلهێزانە بریاری سەر بە خۆش بدەن. ئێستا ئیتر بادانەوەی گورباچوف ئەم بهرەتانەی لـێ بریون. خۆش یا ناخۆش ناچارن دەبێ مل بۆ ویست و ئیـــــرادەو رەحمەتی واشنگتون رابکێشن و چاوەروان بن لە کۆشکی سپیەوە بای (ئازادی و دیموکراسی) یان لێ بداو بەڵکوو ئیشەڵڵا لە ژێـــر بـاری قەرزی چەند سەد ملیاردی سندوقی بەین الملی پول پشت راست کەنەوە و بگەنە ریزی ئەم وڵاتانە کە لە سایەی تەکنیك و چەوساندنەوەی

ولاتانی دنیای سێیەمی سەر بەخۆیان گەیشتوونەتە لوتکەی بەرزایی ژیان و هیچ تەنگو چەڵەمەیان نەماوە ئەوەندە نەبێ تەنیا هەوڵدەدەن کە لە ڕێگای کێشانی خوێنی پتری خەڵکی ولاتانی دنیای سێیەمەوە میللەتەکەی خۆیان تێرو تەسەلتریش بکەن.

## بادانەوەی حیزبە کۆمونیستەکان و کەسانی بەناو کۆمونیست

بە دوای بادانەوەی گورباچوف دا ، زۆربەی حیزبە کۆمونیستەکانی جیهان هەروەك پێشتر بناخەی سیاسەتی خۆیان لە سەر لاسا کردنەوەی سۆڤیت دانابوو ،ئەمجارەش هەر بەم رەقە ڕێگایەدا گوتایان و بە لاسا کردنەوەی گورباچوف دەستیانکرد بە بادانەوە . دیارە هەمویان بە سەر یەك هێڵ و تەوەرو بستێکدا بایان نەداوەتەوە.شێوەی بادانەوەیان لە گەڵ یەك فەرقی هەیە. هێندێ لە حیزبە کۆمونیستەکان لە بادانەوەدا ناوی خۆیان دەگۆڕن و لە قالبی هەموو چەشنە دنیا بینی و تیئوری و ئیدیولوژێك دێنە دەر و خۆیان وەك کیفوك سپی دەکەن. لایان وایە بە ناو گۆڕین هەڵەو چەوتی ئاکاری ڕابردوویان ڕاست دەکەنەوە.
ناوی خۆیان دەگۆڕن ، بیرو باوەری سۆسیالیستی واز لێدێنن، بەلام غیرەتی ئەوەیان نیە هەڵەو کەم و کوریەکانیان ڕاستەو ڕاست بخەنە بەر چاوی کۆمەلانی خەڵك و بە ڕابردووی خۆیاندا بچنەوە. دیارە لە نێو ئەم حیزبانەدا ، ئێواش هەنە کە ڕووداوەکانی سۆڤیت و ئوروپای ڕۆژ هەلات نەیتوانیوە بیرو باوەری سوسیالیستیان پێ لەق بکا و پێیان لەم ڕێگایە باداتەوە .

یەك لەوانە حیزبی کۆمونیستی ئیتالیایە کە ناوی خۆی گۆڕیوە بە (حیزبی دیموکراتی چەپی ئیتالیا). لەم بارەوە دەڵێ : " بریاردان ـ بۆ گۆڕینی ناوی حیزب بە مەبەستی درێژە پێدانی خەبات و کردەوەی کۆمونیستەکانی ئیتالیایە لە مێژووی ولاتدا. بۆ ئەوەیە باشترین بەشی میراتی سیاسی و مەعنەوی حیزب دەستە بەر بکرێ و بە فیرۆ

نەچێ. دەستپێکردنی نوێ لە قۆناخی پێکەمدا بە مانای دەرس وەرگرتنە لە تاقیکردنەوەی سوسیالیزمی واقیعەن مەوجود. شکاتی ئەو سوسیا-لیزمە نابێ وا لە ئێمە بکات کە بە سەر شۆری دان بە سەرکەوتنی سەرمایەداریدا بنێین. شەر ، نابەرامبەری کۆمەلایەتی، دوا کەوتوویی، برسیەتی ، نەخۆشی ، ستەمی جنسی ، فەرقو جیاوازی رەگەزی هێشتا لەو مەسەلانەن کە لە هەمو کاتێ پتر لە گەڵیان روو بەرووین ."

یان ژورژ مارشە سکرتێری حیزبی کومونیستی فەرانسە دەڵێ :

" پێمان دەڵێن : فەرموون ئەوەیە دەسکەوتی سوسیالیزم... سەرمایەداری هەر چی بێت باشترە . لە وەلامدا دەڵێین : لە نابوتی سوسیا-لیزمەوە تا سەرکەوتنی سەرمایەداری کە دەستی راستیەکان دوو پاتی دەکەنەوە، هێشتا مەودایەکی زۆری هەیە . با واقعیەت لە بەر چاو بگرین . ساڵی ١٩٨٩ سەروکی حەوت ولاتی دەوڵەمەندی جیهان لە پاریس کۆ بوونەوە. ئەوان بە راستی دەوڵەمەندن. نکولی لەوە ناکرێ. فەرانسە سەروەتێکی ماددی مەزنی لەبەر دەست دایە . بە راستی خەڵکی ئەوتۆ لە فەرانسە هەن کە لە جاو جەلالیکی باوەر نەکراودا دەژین .وای لێهاتوە یەکێك لە قومار خانەکانی روخی ( لازورن) بە موشتەریەکانی پێشنیار کردوە کە دەتوانن تا ١٥ میلیون فرانك حیساب بکەنەوە. ئەو هەموو سود و قازانجە بە چی و لە کوێوە دێتە دەست ؟. نامەوێ بە قوڵی بچمە نێو ئەم باسەوە. بێدادی قوڵ و نا-تەبایی کۆمەڵی سەرمایەداری نەك هەر لە بەین نەچوە بەڵکو قوڵ-تریش بوە . بیکاری لە سەتا دەی خەڵکی چالاکی ئابوری گرتۆتەوە. بە گوێرەی پێشبینیەکان ساڵی ١٩٩٢ ئەم ژمارەیە دەگاتە سەتی ١٢. بە میلیون خاو وخێزان لە گەڵ تەنگو چەڵەمەی هەراوی ژیان روو بە روو بوون و لە راستیدا ئەوان لە خنکاندان . تریاك و هیروئین، فەساد نائەمنی ، بەرتیل خوری ، رەگەز پەرستی ، کومەڵی ئێمەی قوت داوە. فەرانسە تادێت دەبێتە کۆمەڵێکی نابەرامبەری، دەڵرەشی ، زۆ ر —

ویژی و بی بەزمیی٠

مۆدێلێکی تری کۆمەڵی ئێستای سەرمایەداری ئەمریکایە ٠ ئەمریکا بە هێزترین و دەوڵەمەندترین زلهێزی کۆمەڵی سەرمایەدارییە٠ لە ئەمریکا فەقیرو هەژار لەو شارانەدا دەژین کە کەمایەتی نشینن٠ بە رەنگی پێست دەناسرێنەوە٠پتر لە ٣٥ میلیون ئەمریکایی لە ژێر خەتی فەقردا دەژین ٠ بە گوێرەی پێشبینی رەسمی لە ساڵی دوو هەزار لە چوار منداڵی ئەمریکایی یەکیان تووشی ئەم چارە نووسە دەبێ٠ مەدرەسەی نێونجی و زانستگا بنیاتی تایبەتین ٠ چۆنیەتی خوێندن لە وێبەستراوەتەوە بەم پارەیە کە خوێندکار دەتوانێ بیدا ٠

لەم دواییانەدا دەرکەوتوە لە مەدرەسەو زانستگاکان جنایەتی رەگەز پەرستی سەتی ٥٠ زیادی کردوە ٠ ئەمە لە وڵاتی هەرە دەوڵەمەندی سەرمایەداری ٠ بەڵام وڵاتانی وەك مەکزیك و برزیل و هەموو ئەمریکا لاتینیش سەرمایەدارین ٠ لەم وڵاتانەدا رۆژێ ٢٠ هەزار منداڵ تا تەمەنی پێنج ساڵی لە برسان دەمرن ٠ هەژاری ، برسیەتی ، ئێپیدۆمی نەخوێندەواری ، بێکاری ، خۆفرۆشی مندا ڵان ، رەگەز پەرستی، ژیانی ئەم وڵاتانەیان کاراکتێریزە کردوە ٠ئەم وڵاتانە لە ژێر باری قەرزی وڵاتانی دەوڵەمەندی سەرمایەداریدا نوقم بوون و وەك کۆیلەیان بە سەر هاتوە "

لە بەرامبەر ئەوانەدا حیزبی بەناو کومونیستی دیکەش هەبوون کە لە پێهەڵگوتنی بە درۆی سوسیالیزمی واقیعەن مەوجود بەدەر هیچی دیکەیان بە ئەرکی خۆ نەدەزانی ٠ یان کەسانی واهەبوون هەر بۆئەوەی کە بە کومونیست و یا بە چەپیان بزانن ملی خۆیان دەشکاند٠ ئێستا بە وەزعی شپرزەی وڵاتانی پێشووی سوسیالیستی هەڵدەپەرن ، تف لە رابردووی خۆیان دەکەن٠ ئەم جارە بەلای تاریفی دیموکراسی سەرمایەداریدا بادەدەنەوە٠ بە کورتی لەم چەند ساڵە ی دوییدا لە ژێر کاریگەری بادانەوەی گورباچوف بادانەوە بۆتە دیاردەیەکی باو وتەنیویەتەوە ٠

# یادانەوە لە لای دیکەشەوە

پیمان وانەبێ هەر گۆرباچوف بایداوەتەوەو یادانەوەی فێری حیزبە کومونیستەکان و کەسانی بەناو چەپ کردوە ٠لە دنیای سەرمایەداریش بە خوداچونەوە و یادانەوە لە بوچوون و هەلویستی رابردوویان بەر چاو دەکەوی٠ لیرەدا نە دەرەتانی شیکردنەوەی هەیەو نە ئەرکی ئەم نوسرا-وەشە لیی بکولیتەوە٠بەلام خوناکری باسی یادانەوە ( وەك دیاردەیەکی جیهانی بکەین و بە سەر یادانەوەی سەر کومار بوش دا باز بدەین و چاوی لی بپوشین بە تایبەت کە پیوەندیشی بە مەسەلەی کوردەوە هەیە٠

ناچمە نیو ئەم باسە کە دەولەتی ئەمریکا بو پیادەکردنی سترا-تیژی خوی و جی پیکردنەوەی لە ناوچە نەوتەلانیەکەی خەلیج لە ریگای سازکردنی شەرەوە، چون چرای سەوزی بە سەددامی دیکتاتور نیشاندا ، تا بە بی ترس و بیر کردنەوە لە پاشە روژ ولاتیکی عەرەبی هاو دین و هاو رەگەز داگیر بکا٠ کاتیك مادام (ئیبریل گلیپسی) ـ بالیوزی ئەمریکا لە بەغدا روژی ١٩٩٠/٧/٢٥ بە سەددام دەلی:

" ئەگەر عیراق کویت پەلامار بدا، ئەمریکا ناتوانی هیچ بلی،چو-نکە ئیمە هیچ پەیمانیکمان لەگەل کویت نیە " ٠ئەمە ئیتر بیجگە لە نیشاندانی چرای سەوز ناتوانی مانایەکی تری هەبی٠

دەولەتی ئەمریکا بە نیشاندانی ئەم چرا سەوزە وایکرد کە عیراق کویت داگیر بکاو بە تکاو رەجای هەموو عالەمیش پاشە کشە نەکا و نەیەتە دەری٠ سەددام حوسین بەم کارە دەرفەتی بو ئەمریکا پیکهینا تا بەناوی کومەلی نەتەوە یەکگرتوەکان (تو بلی کومەلی چەند دەولە-تیکی یەکگرتوو) و بە سەرکردایەتی لەشکری چەند دەولەتان عیراق بخاتە بەر پەلاماری هەوایی و دەریایی و زەمینی و بیکاتە مەیدانی

تاقیکردنەوەی چەك و فرۆکەی تازە ساز و بۆ (ئازادی کویت و گێرانەوەی بنەماڵەی مافپەروەری ئال سەباح و بۆ پاراستنی حکومەتی دیموکــرات و موسلمانی عەربستانی سعودی) بێجگە لە ئاتوم هەموو چەکێکی مۆد ێرن و تازە بابەت بەکار بهێنێ. سەدام لە کویت وەدەر بنێ، بـەلام بە ملکەچی و رەزیلی بیهێڵێتەوە. چونکە لە ستراتیژی پینتاگۆنـدا سەددام ئەشێ بمێنێتەوە. بەلام دەبێ بێ هێز بکرێ و بۆ گشت فەرما- نی ئیمپریالیزمی ئەمریکا مل حیز بکاو سەر دابنوێنێ. ئـە مــە باسێکی جیاوازە و شیکردنەوەیەکی خەست و هەموو لایەنەی گەرەکـەو لەم نووسراوەدا جێگای نابێتەوە.

مەبەستی ئێمە پتر روونکردنەوەی بادانەوەی بوش سەرکــۆماری ئەمریکایە کە بە گوێرەی ستراتیژی پنتاگۆن لە رووخانی ریژیمــی بەعسی عیراق وازی هێنا. بەلام داوای لەخەڵکی عیراق کرد کە لـە سەددام راپەرن و بیروخێنن. بۆ هاندانی خەڵکیش رایگەیاند کـە رێگا نادا فرۆکەو هیلیکوپتەری عیراق وەحەوا کەون. پاش راپەر- ینی خەڵك بوش لە قسەکانی خۆی بادایەوە و بوو بە هۆی کوشتــاری خەڵکێکی زۆر و دەر بەدەری پتر لە دوو میلیون کورد و عەرەبــی خوارووی عیراق. بادانەوەی سەرکۆمار بوش تینی وەبەر سەددام نا تا جارێکی دیکەش راپەرینی خەڵك لە خوێندا نوقم بکا.

ئەوە راستە کە کیم و زوخاوی بریتی چەند ساڵەی دام و دەزگــای جنایەتکاری سەددامی خوێنمژ لە ناخی گەلی کوردا پەنگی خـوارد بوۆە و لە دەرفەتێك دەگەرا کە بیتەقێنێ و ئەم کیم و زوخاوە بریژێ بەلام بێگومان هاندانی بوش و تەبلیغاتی (سی ئای ئێ) لە راپەرینی خەڵکدا بێ تەئسیر نەبوو.

کاتێك دەزگای سەر کوتکەری رژیمی بەعس کەوتە کار و فرۆکـەو هیلیکوپتەری سەددام دەستیان بە بۆمباران و کوشتاری خەڵکی شارەکان کرد، جەنابی سەرکۆمار خۆی بە راوە ماسیەوە دەخافلاند و بــێ

ئەوەی تەریق‌بیتەوە بایدەداوە و دەیگوت: " ئێمە بۆ کێشەی نێو خۆی عیراق خوێنی سەربازانی ئەمریکایی بە رشتن نادەین .

رۆژنامەی نیویورک تایمز نووسی: "(سیا ) لە ڕێگای رادیوی دەنگی (عیراقی ئازاد) ەوە لە هاندانی کوردەکان بۆ روخانی سەددام حوسیـن دەوری هەبوو. کوردەکان لە ڕێگای رادیوییکی نهێنیەوە کە(سی. ئای. ئێ) دایمەزراند بوو، بۆ روخاندنی سەددام هاندەدران. یەکێك لــــە کوردەکانی دانیشتوی لەندەن رایگەیاند کە سەرویـی ئەمنیەتـــی عەرەبستانی سعودی ئەوی بە کارمەند گرتوەتا لە ئیزگەیەکی رادیـوی نهێنی بە ناوی (دەنگی عیراقی ئازاد) بۆ هاندانی کوردەکانی عیراق بۆ روخاندنی سەددام وتار بلاو بکاتەوە.

دوکتور (فریاد عویزی ) لە وتوێژێک لە گەڵ رۆژنامەی نیویورک تا- یمز گوتی : " من لە گەڵ چەند کەسیتر لە کوردەکانی دژی سەددام لە مانگەکانی فیوریە ومارس ، لە سەر ئەو باوەرە کە رۆژئاوا لــــە فریای کوردەکان دێت ، لە رادیوی (دەنگی عیراقی ئازاد ) وتارمـان بلاو کردوتەوە و کوردەکانمان بۆ راپەرینی دژی رێژیمی بەغدا هــان داوە". بە قسەی دوکتور عویزی ئەم رادیویە لە گەرەکێکی شاری(جددە) چل کەس کێشکیان لێ کێشاوە . شەبەکەی تەلیڤیزیونی( ان.بی.سی.) رایگەیاند کە (دەنگی عیراقی ئازاد) مەخلوقی (سیا ) بوە ".

رۆژنامەی " وال ستریت ژورنال " نووسیبووی : " لە نەزمی تـازەی جیهاندا کە ئەمریکا دەیەوێ دایمەزرێنێ ، نایەوێ راستەو خۆ دیکتا تورەکان بە دەستی خۆی برووخێنێ. هەر لە سەر بنەمای ئەم سیاسە- تە بوو کە بوش و هاوکارەکانی چاوە روانی ئەوە بوون کە خەڵکی دیکە سەددام بروخێنن. ئاغای بوش خۆی داوای لە موخالیفەکانی سەددام کرد کە خۆیان لە دەست ئەو نەجات بدەن . سازمانی (سی. ئای. ئێ) دەزگای رادیوی نهێنی لە عەربستان خستە کار کە عیراقیە ئاوارەکان بە رێوەیان دەبرد و خەڵکی عیراقیان بۆ روخاندنی رێژیمی سەددام- هاندەدا .

رۆژنامەی ئیران تایمز نووسیبووی : " مەسعود بارزانی و جەلال-
تالّبانی لە بەیاننامەیەکدا داوای یارمەتیان لە سەر کۆماری ئەمریکا
کرد. لە بەیاننامەکەدا بە بوش گوترا بوو : ئێوە خۆتان داواتان لە
خەڵکی عیراق کرد کە دژی سەددام راپەڕن . ئێستا ئەو راپەڕیوانە
لە گەڵ هێزی ستەمکاری سەددام لە شەر دان .

ڕێبەرانی کورد لە ئەمریکایان ویست کە ڕێگا نەدا سەددام دژی
راپەڕیوەکان فڕۆکەو هیلیکوپتەر بە کار بێنێ. بەڵام کۆشکی سپی
ڕۆژی هەینی رابردوو داخوازی کوردەکانی رەتکردەوەو رایگەیاند
کە ئەمریکا نایەوێ دەست بخاتە نێو کاروباری نێو خۆی عیراقەوە.
وتە وێژی کۆشکی سپی گوتی : " مەسەلەی بەڵبەشۆی نێو خۆی عیراق
پێویستە لە نێوان دەوڵەت و خەڵکی عیراقدا چارە سەر بکرێ".

دان کویل جێگری سەرکۆماری ئەمریکا لە وتوێژێکدا لە گەڵ رۆژنا-
مەی فیگارۆ چاپی پاریس رایگەیاند : " رووخاندنی سەددام قەت ئاما-
نجی رەسمی ئەمریکا نەبوە .ئێمە چەند جار ئەوەمان دوو پات
کردوّتەوە . "

رۆژنامەی ( وال ستریت ژورناڵ )نووسی : "بوش و راوێژکەلی لە کۆبو-
نەوەیەکی مانگی مارس دا ،بریاریاندا خۆ لە نائارامیەکانی نێو خۆی
عیراق بکێشنەوەو سەربازانی ئەمریکا لە عیراق بێننە دەرێ. کار
بە دەستانی ئەمریکایی لە سەر ئەو باوەڕەن لە بەر یەکنەبوونی بیرو
رای سەر کۆمارو هاوکارەکانی لە مەر خۆ تێهە ڵقوتاندنی عیراق وستی
یارمەتیدانی لیقەوماوان هێندێ دەسکەوتی سیاسی کە لە شەڕی خەلیج .
بە نسیب سەر کۆمار ببوو، بە فیرۆ چوو. بیرورای گشتی جیهانی
لە پێشدا ئورووپاو پاشان ئەمریکا بوو بە هۆی ئەوە کە ئاغای سەر
کۆمار بوش باداتەوەو چاو بە بریارەکانیدا بخشێنێتەوە. دوای ئاخا-
فتنی تەلیفونی لە گەڵ میتران و جان میجر و کۆل و تورگات ئوزال،
بە سەر سەنگی ناچار بوو دان بە هەڵەکانی خۆیدا بنێ و سیاسەتی

خۆی دەسکاری بکاتەوە و باداتەوە بۆ ئەوەی پەناگا بۆ کوردان ساز- بکا . بوش لەم کارەدا ئەوەندە بەخێرایی بایداوە کە رۆژی چــواری ئەپریل تا سەعاتی چواری دوای نیوەرۆ هاوکارەکانی نەیاندەزانی ئاخۆ کونفرانسی چاپەمەنی بۆ ریکخەن یان نا ".

رۆژنامەی ( واشنگتون پۆست) نووسی : " دیپلوماتەکان لە سەر ئــەو باوەرەن کە پیکهینانی ناوچەی ئەمنیەت بۆ کوردەکان، وەزعیکی دژوار بۆ ئیران پیك دینی. ئەو دیپلوماتانە وە بیر دەخەنەوە کە ئەمریکاو ئیران لە کورت ماوەدا ، هیندی بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە. ئیران- وەك دەولەتە دراوسیەکان لەوە دەترسی کە تیکچوونی تیکەلاویــــی رەگەزیی عیراق شوینەواریکی نالەبار بخاتە سەر تیکەلاویی خەلکی ئیران کە لە فارس و بەلوچ و عەرەب و تورکەمەن و کورد و ئازەری پیك هاتوە . دەولەتی ئەمریکاو ولاتانی تری رۆژئاوا لەم ترسەدا لە گەل ئیران شەریکن .

هیزەکانی ناوچە نیگەرانی ئەوەن کە پیکهینانی ناوچەی ئەمنیەت بۆ کوردەکان ببیتە هۆی هاندانیان بۆ جیا بوونەوە، یان لانی کــەم هەستی ناسیونالیستی لە کەمایەتیە رەگەزیەکاندا بجولینی. گشــت هیزو دەسەلاتەکان ترسیان لەم هەستە هەیە، بۆیەدژی دەوەستن .

رادیوی دەنگی ئەمریکا رۆژی ١٦/ ٤/ ٩٩١ رایگەیاند کە نوینەری ئینگلستان لە چاو پیکەوتنیکدا بە کەمالی خەرازی نوینەری حکومە- تی ئیرانی گوتوە : " گەلالەی ناوچەی ئەمنیەتی بۆ کوردەکان، بــە مانای پیکهینانی کوردستانیکی خود موختار نیە لە عیراقدا. ئــەم گەلالەیە هیچ ئامانجیکی سیاسی نیە . تەنیا دیاردەیەکی ئینسانیە".

وەك رۆژنامەی ناوبراو دەنووسی ، هەر چەند سەرکۆماری ئەمریکا لە ژیر گورمی بیرو رای گشتی ئوروپاو ئەمریکادا بایداوە کە پەناگا بۆ کورد گەل ساز بکا و هیلی ٣٦ دەرەجە بۆ پاریزگاری کوردەکـــان دیاری بکات، بەلام کەس نەبوو لە ئاغای سەر کۆمار بپرسی :

بۆ کوردستان هەر لە هێڵی مەداری ٣٦ دەرەجە دایەو کوردیش هەر لە دهۆك و زاخۆ دەژین ؟٠

ڕۆژنامەی ئەکسەریەت نووسی : " گەلاڵەی ناوچەی ئەمنیەت لە (شیمالی مەداری ٣٦ دەرەجە) دەبوو بە هۆی ئەوە کە ئەم ناوچەیە بکەوێتە ژێر دەسەلات و کونترۆڵی ئەمریکاو تورك و ئینگلیز و فەرانسە ٠ ئیتر کاروباری ئەم ناوچە دیاریکراوە بە دەست ئەم هێزانە دەبوو٠ بزووتنەوەی کورد لە ژێر ناوی ئینساندۆستیدا قەتیس دەکرا٠ لە لایەکی تر دەرەتان بۆ سەددام پێك دەهات کە ناوچەکانی دیکەی کوردستان کە نەکەوتوونە بەر (مەداری ٣٦ دەرەجە) بکاتە عەرەب نشین و کوردی تێدا نە هێڵێ٠ لە کاتێکدا مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی سیاسی و مافی ژیان و سەربەخۆییە لە زێدو نیشتمانی خۆیدا "٠

ڕۆژنامەی (نیویورك تایمز) نەختێك پەردە لە سەر ئەم روکارە دووروییە لادەداو دەنووسێ : " وادێتە بەرچاو کۆشکی سپی لە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە خۆ دەبوێرێ کە پێوەندیان بە دوا ڕۆژی کوردستانی عیراقەوە هەیە ٠ دەیەوێ لە تێکچوون لە گەڵ تورکیا خۆ دوور خاتەوە کە گەورەترین کەمایەتی کورد لە وێدا دەژی٠ کۆشکی سپی ، بە کوردەکانی دژی حکومەتی عیراقی راگەیاندوە کە نابێ لەم پەناگایانە بۆ پەلاماردانی حکومەتی عیراق کەلك وەرگرن ٠ دەوڵەتی بوش خەڵکی ئەمریکای دڵنیا کرد کە گەلاڵەی پانا بەران بۆ ماوەیەکی کورتەو ئەمریکا خۆ لە کاروباری سیاسی عیراق هەڵناقوتێنێ "٠

کیسنجر وەزیری پێشووی ئەمریکاکە لە تێکدانی شورشی کوردستانی عیراقدا دەستێکی چەپەڵی هەبوو دەڵێ : " دژواری دابینکردنی سیستمێکی نێو نەتەوەیی بۆ پاراستنی کوردەکان لەوە دایە کە ئەم کارە دەبێتە جورە خود موختاریەك بو کوردەکان و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە کە واشنگتون لە گەڵ تورکیاو ئیران و سوریا بەرەنگار

دەبێ کە کورد لەم وڵاتانەدا دەژین ."

بەڵێ ! بە لای کاربەدەستانی حکومەتی ئەمریکاوە سیستمێکی نێو-نەتەوەیی بۆ پارێزگاری کوردەکان نابێ دابمەزرێ، چونکە ئیران و تور-کیاو سوریا لە گەڵ واشنگتون بەرەنگار دەبن . لایەنگری لە مافی مرۆڤیش هەر ئەوەیە ! ! ! .

ڕۆژنامەی ( بالتیمور سان ) لە ژێر سەر خەتی " کوردە ئاوارەکان و-پەیمان و بەڵێنی ئەمریکا " دا، دەنووسێ : "

" ئەمریکاییەکان باش ئاگادارن کە شەر چی بەسەر کوردو شیعە هێناوە لە عیراقدا . بەڵام لە بەر ئەوەی ترسیان لە دواڕۆژی ئەو مەسە-لەیە هەیە، بیری لێ ناکەنەوە . کوردەکان پشتیوانی (داواکاری) دایمی ئەمریکان-یا نە هێشتنی سەددام . بەڵام ئەوانە هیچ کامیان لە گەڵاڵە و بەرنا-مەی ئاغای بوش دانین . بۆ ئەمریکاییەکان ئەشێ ڕوون بێتەوە کە لە باری سیاسیەوە ڕەنگە بگرێ نان بدەی بە کوردەکان و یان ( غەزمیەکی تازمیان) بۆ ساز بکەی . بەڵام لە باری ئەخلاقیەوە نەک ئەوە هەر پەسندو قابیلی قبوڵ نیە، بەڵکوو لە ڕاستیدا جنایەتیشە . چونکە ئەمە بەرهەمی شەرێکە کە داوا لە خەڵکی عیراق کراوە دژی سەددام حوسین ڕاپەرن " .

ڕۆژنامەی ( فاینانشل تایمز ) لە ١٢ ی ئەپریلی ٩١ دا نووسی : "

" کوردەکان جارێکی دیکەش وێڵی چارە نووسی خۆیان کران . ٢٨ ی مانگی فیوریە ئاغای بوش فەرمانی شەر ڕاگرتنیدا . فەرماندەی هێزی هاو پەیمانەکان ڕایگەیاند کە ئەرتەشی عیراق لە هەموو بارێکەوە تێك شکاوە . لە ماوەی چەند ڕۆژدا عیراق بە گشتی ڕاپەری . کوردە-کانیش ڕەگەڵ ئەو ڕاپەرینە کەوتن . ڕەنگە کوردەکان پێیان وابوبێ، کە بۆ ڕزگاری لە دەست سەددام باشترین هەلیان بۆ هەڵکەوتبێ .

ئەوەی کوردەکان بە ڕاستی چاونواری نەبوون ئەم هەڵوێستانەی ژێرە-وەی دەوڵەتی ئەمریکا بوون :

ـــ راگەیاندنیبێلایەنی و دەست نەخستنە کاروباری نێو خۆی عیراق ·

ـــ بڵاوکردنەوەی هەڵسەنگاندنی دەزگا ئاکاداریەکانی پنتاگۆن کە ئاخرەکەی رێژیمی عیراق بەسەر راپەریوەکاندا سەر دەکەوێ ·

ـــ بڵاو بوونەوەی وتەی کاربەدەستانی ئەمریکایی کە گوتویانـــە : دەوڵەتی ئەمریکا هیواداره بەر لەوەی راپەریوەکان بتوانن سەددام بروخێنن، ئەرتەشی عیراق بتوانێ سەرکوتیان بکا · ناوی ئەم کار بە دەستانە بڵاو نەکراوەتەوە ·

ـــ خۆگری کاربەدەستانی ئەمریکا لە چاو پێکەوتنی موخالیفەکانی عیراق ·

کاتێك سەر کۆمار بوش رایگەیاند کە نابێ هیلیکوپتەر وفرۆکـــەی نیزامی عیراق دژی راپەریوەکان بەکار بهێنرێن، وادەهاتە بەر چاو کە سیاسەتی ئەمریکا گۆرانی بەسەردا دێت · بەلام سێ‌شــەمـوی رابردوو ، دەوڵەتی ئەمریکا رایگەیاند مەگەر هیلیکۆپتەرەکانیعیراق بۆ هێزی هاو پەیمانەکان مەترسیان هەبێ دەنا هیچ هەنگاوێك دژی ـ ئەوان ناوێژرێت ·زەحمەتە بیر لەوە نەکرێتەوە کە راگەیاندنی ئـەم سیاسەتە بێجگە لە نیشاندانی چرای سەوز بە دەوڵەتی بەغدا بـــۆ لێدانی زەبری فرە توند لە کوردەکان و بۆ کەلك وەرگرتنی تەواو ـ لە هیلیکۆپتەری نیزامی دژی راپەریوەکان، مانایەکی تری نیە ·

قسەی وتە وێژی کۆشکی سپی زۆر جێگای نارەحەتیە کە دەڵێ : " ئێستا ئەوە خەلکی عیراقە دەبێ لە بارەی داهاتووی سیاسی خۆیا ـ نەوە بریار بدەن " بەراستی سەیرە · هەر دەڵێی لە عیراق رێگا بۆ چارە سەر کردنی هێنانە و یا ریفراندوم هەیە ·

فاینانشل تایمز لە ئاخری وتارەکەیدا دەنووسێ: " ئەگەر نەزمـــی تازە ئەوەیەو ئێمە بۆ سەقامگرتوویی ئەو نەزمە لە کەنداو شەرمان کردوە، ئەم نەزمە لە گەڵ رابردوو هیچ فەرقی نیە و باشتریش نەبوە "

رۆژنامەی ( فیلاد لفیا ئینکوایرر ) ١٩ ی ئەپریلی ١٩٩١ دەنووسێ :

" سەرکۆماری ئەمریکا بۆ پێشگری لە کوشت و کوشتار شەری عیراقی راگرت • بەڵام بریاری بوش بە کردەوە بوو بە هۆی کوشتاری پتر• ئەو گیانی ئەو سەربازانەی نەجات دا کە پاشان کوشتاریان لە خەڵکی غەیرە نیزامی کرد• ئەمریکا لەوە دەترسێ کە ئەگەر حیزبی بەعس کە بە کوشتارو دڵرەشی عیراقی یەکپارچەی راگرتوە برووخێ، ئەو دەم عیراق بە سێ بەشی کورد نشین و سوننی نشین و شیعە نشین دابەش بکرێ• "

بزووتنەوەی هاو پێوەندی ئێرانیەکان بۆ ئازادی و دیموکراسی ، سەبارەت بە کوشتاری میللەتی کورد لە عیراق نامەیەکی بۆ سەر کۆماری ئەمریکا نووسیوە و دەڵێ : " حکومەتی ئێوە لە جەنگەی شەری خەلیجی فارس دا بە وتارو رادیو و بەیاننامە خەڵکی عیراقی بۆ راپەرین و روخاندنی رێژیمی سەددام هاندا • لەو کاتەدا کە خەڵکی عیراق لە شیمال و جنوب راپەریبوو، دەوڵەتی ئێوەو هاوپەیمانەکانتان بە بیانووی دەست نەخستنە نێو کارو باری نێو خۆی عیراق، بوون بە تەماشاچی کوشتاری موخالیفەکانی رێژیم و دەستی سەددام حوسینی جنایەتکارتان لە نابوتکردنی میللەتی کوردا ئازاد کردوە •

ئاغای سەر کۆمار!، ئەم فەرمایشاتەی ئێوە، واتە دەست نەخستنە نێو کاروباری نێو خۆی عیراق و ئازاد کردنی سەددام لە کوشتار و جنایەت ، بێجگە لە وتەی بێ جێی دیپلوماسی هیچی دیکە نیە •نەك هەر ئەوە کەس بروای پێ ناکا ، بەڵکوو لە باری ئەخلاقی و ئینسانیش بۆ پاکانە نابێ •

ئاغای سەر کۆمار ، کاتێك هێزی سەرکوتکەری سەددام بە سەر کوردە کاندا سەرکەوت ، کە هیلیکۆپتەرەکانی عیراق بە ئیجازەی ژەنراڵ شوارتسکوف بە بۆمبای فوسفور و سووتێنەر کوردەکانیان بۆمباران دەکرد داخوائێوەو ژەنراڵ شوارتسکوف بو ئەم بریارە بێ ئەخلاق و سەر سور

هێنەرە وەڵامێکتان هەیە ؟ "٠

ڕۆژنامەی ڕێگای ئازادی نووسی : " ئەو دەوڵەتانەی کە دەیانتوانی بۆ دەستگێرانەوەی سەددام لە کوشتاری کوردەکان خێرا دەست بە کار بن و هەنگاو بنێن، بە بیانووی دەست تێوەرنەدان لە کاروباری نێو خۆی عیراق، لە دەربڕینی داخ هەورازتر نەچوون ٠بە ئاشکرا بوون بە تەماشاچی کوشتاری کوردەکان ٠ سەیر ئەوەیە هەر ئەم دەوڵەتانە دەتوانن بە ئاشکرا لە ئەفغانستان و کامبوج و نیکاراگوا و پاناماو ئەنگولا بێ ئەوەی نیگەرانی دەست خستنە ناو کاروباری نێو خۆی ئەم وڵاتانە بن ، یارمەتی بە دژی ڕێژیمەکان دەدەن ٠

لە جەنگەی کوشتاری کوردەکاندا لە پڕ مەسەلەی تەواویەتی عەرزی عیراق بۆ ئەمریکا هاتە گۆڕێ و بوو بە مەسەلەی دەرەجە یەك ٠

چین و سوڤێت بە مەسەلەی نێو خوییان داناو فەرانسە لە دەربڕینی داخ و نیگەرانی تێ نەپەڕاند٠ ڕۆژ ئاوا ١٠٠ میلیارد دۆلاری بۆ ئەستاندنەوەی کویت خەرجکرد ، بەڵام یەك هەزارەمی ئەو پارەیەی بۆ لێقەوماوانی کورد تەرخان نەکردوە "٠

هێنانەوەی نووسراوەی ئەم چەند ڕۆژنامە گەلی ئەمریکاییم بۆیە بە پێویست زانی تا خوێنەرانی کورد سەیرێکی بۆچوون و لێکدانەوەی چاپەمەنی و بیرو ڕای گشتی جیهان بکەن و توزێك شارەزای سیاسەت و هەڵوێست و بادانەوەی سەرکۆماری ئەمریکا بن و لە گەڵ بۆچوون و هەڵوێستی هێندێ ڕووناکبیرو سیاسی کورد بەراوردی بکەن کە لایان وایەهەوری ڕەحمەت و دیموکراسی و مرۆڤ پەروەریئەمریکا بەری عا- سمانی ڕۆژهەڵاتی نێوەراستی گرتوە و هاکا دایدەداتە بارانە و لە سەر وێرانەو کاولەکانی کوردستان گوڵە شلێرو مێلاقەو هەڵاڵە دەروێنێ ٠!

ڕاستە سەرکۆماری ئەمریکا هەروەك لەم نووسراوانەدا نیشاندرا لە ژێر زەختی بیرو ڕای گشتی ئوروپا و ئەمریکادا ، ناچار بوو لە

بادانەوەی پێشووی وەر سوڕیتەوە و جارێکی تر بەلای( ئینساندۆستی و خێر خولایی) دا باداتەوە. بەلام بە بیرو رای من ئەم بادانەوە نەك هەر قەرەبوی بادانەوەو هەنگاوی دوورویانەی پێشووی نەکردەوە، بەلکوو مەسەلەی کوردی لە جەغزی چارە سەر کردنی بنەرەتی کە مافی بڕیاردانی چارە نووسە هەتلە کردو لە چوار چێوەی تاندان و چادرو پەناگاو ( غەزەی دوەم) دا هێشتەوە.

راستە ئەوەندە لە فریا هاتنە بۆ رزگاری لە برسیەتی و سەرماو سۆل و بێ نەوابی، هەنگاوێکی ئینسانانە بوو، نابێ حاشای لێ بکری و جێگای سوپاسە . بەلام بەراستی من ئەو شێوە نان بۆ فرێدانەم بە شکانی کەرامەت و کەسایەتی کورد دەهاتە بەرچاو و پتر لە دەربە دەریەکە جەرگمی هەلدەچزاند.

مەسەلەی کورد لە کوردستانی خواروو لەوە دەرچوو بوو کە بە تور هەلدانی نان لە حەواوە و بە نیشاندانی ئەو دیمەنە داخدارانە چاری بکرێ. ئاغای بوش بۆ پاراستنی رێژیمی ( دیموکراتی) سعودی و کویت هەزاران کەس قردەکات و سەدان سەربازی ئەمریکا بە گوشت دەدا، بەلام بۆ پاراستنی چەند میلیون کورد( نایەوێ خوێنی سەربازی ئەمریکا برژێ) !!

تۆ بلێی ئاغای سەر کۆمار وتەی ئەم ژنە کوردەی نێو قورو لیتەی بە ربارانی بە گوێ نەگەیشتبێ کە دەیگوت : " ئەمریکا بۆ میلیونێك خەلکی کویت ئەم هەرایەی ساز کرد، بەلام کورد پێنج میلیونە و کەس لە سەری وەدەنگدنایە ".

پیاو بلێ چی ؟.. ئەو هەموو پرو پاگاندەی ئامریکاو رۆژئاواو پێ هەلاگوتنی خەلکی سادەو رەمەکی لە مەر ئازادی و دیموکراسی و ماف پەروەری گەورەترین ولاتی سەرمایەداری جیهان، چاوە روانی پتری لێدەکرا، بەلام سەرکۆماری ئەمریکاش وەك گەلێك خەلکی بێ پرنسیب بادانەوەی پێ عەیب نیە و چاوەروانی پتریشی لێ ناکرێ. چونکە

نه ریبەرانی کورد بە قەدرایی مەلیك فەهدو شیخ جابر و تورگات ئوزال ( دیموکراتن و مافی مرو دەپاریزن )، نه ئەوەندەیان پارە هەیە لە بانگەکانی ئەمریکا دا و نه چاوەڵاو نەوتیەکانیان لە بەر دەستی خویاندایه. جا بویە ئەنجامی بادانەوەی سەر کومار بوش هەر ئەو دیمانانە دەبن کە لە تەلەڤیزیوندا نیشاندەدران و ئەو رەسمانەی لیرە دا دەبینرین.

# بادانەوە لە نێو کورداز

هەر وەك لە سەرەتادا باسکرا ، بادانەوەی لە نێو کورد لە مێژەوەبا کورد لە بەر بادانەوەو ئەم بەرەوبەر کردن کەمتر ڕێگای ڕاستی بۆ دۆزراوەتەو ، بەداخەوە کەسیش تا ئێستا لە سەر ئەم باسە نەینوسیو و قازانج و زیانی بادانەوەی لە نێو کورداندا هەڵنە سەنگاندوە ، لەم حاڵەدا مرۆف دەکرێ تەنیا باسی ئەوانە بکا کە خۆی ئاگاداریانەو خەڵکی دیکەش ڕەنکە لە بیریان بێ ، بادانەوە لە نێو کورداندا بەرهەمی جیاوازی هەبوە ، بادەرەوە یا سەری تێداچوە ، یا تووشی خەیانەت بوە و یا تەنیا ماندوو بوونی پێ ماوە ،

سمایلاغای شکاك پاش ڕاپەرین و دەر بەدەری فریوی عەجەما نی خواردو بایداوە هاتەوە بەر دەستیان و بە خۆرایی کوژراو بۆ ماوەییکی زۆر بزووتنەوەی کوردی پێ کپ و ماتبوو ،

مەلا خەلیلی گۆرۆمەری دوای ڕاپەرین چوە گەرمێن و پاشان بایداوە هانەوە بەر دەستی عەجەمان و بە ئیمزا کردنی فتوای ئیعدامی پێشەوا قازی محمد، تووشی خەیانەتێك بوو کە بە هیچ شتێك بۆی نا شۆرێتەوە ،

بادانەوەی ( قەرەنی) شمان هەیە ، قەرەنی پیاوێکی وێچووی کەڵەکەتی ڕەنگ پیاوی مەنکور بوو، لە گوندی میراوێ تێکچوو بوو، دایمە سیغار لە سەر لیو و بە جادەی نێو گوندی دا هاتوو چۆی دەکرد، لە پڕ یەکێك بانگی دەکرد و دەیگوت : " قەرەنی باوەدە ) ، قەرەنی لە جێی خۆی ڕاست بایدەداوە ، دیسان یەکی تر بانگی دەکرد ( قەرەنی باوەدە) قەرەنی دیسان ڕاست وەر دەسوراوە و دەرۆیشت ، ئەم خەڵکەی

که کەمتر بەزمیان بە تێشکاو ولێقەوماودا دێ، ئەوەندەیان بە قەرەنی بادەداوە، تا شەکەت و هیلاك دەبوو، ناچار لە هەر کوێ با بوێ دادە-نیشت . بادانەوە لە نێو سیاسی و روناکبیرو ئازادیخوای کوردا ئەوەندە بوتە باو، دەستی لە قەرەنی ئەستاندوە .

تۆزێ بۆ دوایە بگەرێینەوە . بادانەوە لە ئامانج و سیاسەتی کۆمە-لەی ژێ.کاف . ئێستاش روون نەبوە بۆچی لە کۆمەڵەی ژێ.کاف . بایانداوەو حیزبی دیموکراتیان لە جێ دامەزراند، بێ ئەوەی هویەکەی بۆ خەڵك روون کەنەوە . رەنگە لەم بارەوە بۆچوون و شیکردنـــەوەی جیاواز هەبێ. بەڵام بۆچوون و لێکدانەوەی بێ سەنەد و بەڵگە بـــۆ لێکۆڵینەوەی زانستی پشتیان پێ نابەسترێ.

لە سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستاندا، بە شێکی زۆر لە ئاغا و سەرۆك عەشیرەتی کورد، پشتیان لە بزووتنەوەی کورد کردو بایاندا-وە بۆ لای حکومەتی تاران وبوونەوە بە خزمەتکاری بێگانە .

بادانەوە ئیتر لە نێو روناکبیرە سیاسیەکاندا بوو بە باو، وای لێ هات عەیبەی لە سەر هەڵبگیرێ. سەرنجێکی سەرجەمی بزووتنـــەوەی رزگاریخوازی کورد بدەین لە ٥٠ ساڵی دواییدا، دەبینین زۆربەی رێبەرو کادرو هەڵسوڕێنەری جولانەوەی کورد قەت هەتا سەر لە سەر تەوەر و بستێك نەوەستاون و هەر یەکەی یەك دوو جار بایانداوەتەوەو ئەمبەرەو بەریان کردوە . جا چ لە مەیدانی ئەندامەتی حیزبی و تێکوشانی سیاسی و یا لە بواری بیرو باوەرو ئیدیولۆژیدا بووبێت .

دروشمی جۆر بە جۆری وەك : خود موختاری، سەربەخۆیی، بریار-دانی چارە نووس، دیموکراسی، ئازادی، بەرامبەری، یەکسانی، مافی مروڤ، مارکسیەت، میللیەت، کوردستانیەت و ... هتد، ئەوەندەیان-لاپەرەی کاغەز پێ رەشکراوەتەوە و ئالو گوریان پێکراوە، کە لە حیساب نایە . دۆست کراوە بە دوژمن، دوژمن کراوە بە دۆست، عەرەب و-تورك و فارس کراون بە برا، پاشان کراونەوە بە نەیار و شۆفێنی .

خەڵك كراوە بە جاش ، جاش كراوەتەوە بە شورشگێڕ ، وڵات پارێز كراوە بە زوڵە كورد و زوڵە كورد كراوە بە نیشتمانپەروەر و ...
ئەوانەی باشیان نەداوەتەوە ئەوا سەیری بادەرەوەكان دەكەن و بە قەولی زانای بەناوبانگی كورد، مەلا محەمەدی كۆیی : " ناو جەرگیان بۆتە پەلاس " . سەیرە، هەر دەڵێی بادانەوە بۆ كورد بۆتە شتێكی سروشتی و خودا دادی . دوور نیە تۆزێكیش ئەخلاق و رەوشتی عەرەب كاری تێكردبی . چونكە لە سەدری ئیسلامەوە مورتەد بوون و لە دین وەرگەران و بادانەوە باو بوە و تا ئێستاش بەر دەوامە .
گوتمان بەشی زۆری بادانەوە لەم ساڵانەی دواییدا لە ژێر تەئسیری پریسترۆیكادا بوە . بەڵام لە كوردستان پێش پریسترۆیكاش بادانەوە كەم نەبوە . رێكخراو و كەسانی واهەبوون كە لە مەیدانی كوردایەتیدا چالاك بوون و پاشان كەوتنە بیری فەقیری و هەژاری كریكارانی ولاتانی سەرمایەداری و فەلەستین و بەولادا بایانداوە . لە كوردستانی خواروو كە خەبات توندتر بوە بادانەوەش بەبرەوتر بوە لە بەشەكانی دیكە . سەیرێكی نووسین و ئاخافتنی هێندێ لە رێبەرانی حیزبە كوردستانیە كان بكەین ، دروشمی سەرەكیان دیاری كردنی چارە نوس ، سەربەخۆ یی ، ئوتونومی ، روخاندنی رێژیمی بەعسی ، و ...هتد بوە . بەڵام لە گەڵ توانەوەی سەهوڵی توندو تیژی نێو دەوڵەتان كە بەرهەمی بادانەوەی كورباچوفە ، وە لەدوای شكانی قورسی ٨٩ ئەم جارە بۆ لای ( بیر كردنەوە بە عەقلیەتی نوێ ) بایانداوەتەوە . باسی دیموكراسی پلورالیزم ، مافی مرۆڤ ، یەكێتی كورد و عەرەب ، پاشگەز بوونەوە لە سەربەخۆیی و فیدرالیزم و اتحادی اختیاری و ..جێگای گرنگ و تایبەتی لە نوسین و ئاخافتنی ئەواندا دەگرێتەوە .ئاكامی ئەو بادانەوە و بە خۆدا چوونەوە و دەسكاری كردنی سیاسەتی پێشوو دەگاتە پلەی دەستە ملان بوون و ماچ و موچ لە گەڵ دیكتاتوری خوێنمژی كورد و وتوو وێژ بۆ زیندوو كردنەوەی خود موختاری ساڵی ١٩٧٠، بە بیست

ساڵ فەرقی زەمان و مەکان و کوردستانێکی وێرانەو کاوڵ کراوە
دیارە یادانەوەی ئەمجارە ئەگەر پریشکێکی پچوکی پریستروێکای بۆ چووبێ، بەشی هەرە زۆرو گرنگی سەپانی واقعیەتێکە لە ویست و ئیرادەی ئەم رێبەرانە بەدەرە • لە بەر چاو گرتنی بارو دۆخی کوردستان و بەرهەمی یادانەوەی سەر کۆماری ئەمریکاو گەمەی دەولەتانی رۆژ ئاوایە • هەنگاوێکە بە بۆچوونی خۆیان، بۆ چارە سەر کردنی کاتی و تیمار کردنی زام و برینی تەشەنا بووی جەستەی کوردستانی خوارووە•
لە سەر یادانەوەی ئێستای کوردستانی عیراق باسێکی هەراو ، بۆچوونی جۆر بەجۆرو لێکدانەوەی جیاوازو رەخنەو نارەزایی زۆر هاتۆتە گۆرێ•بە بروای من هەرچی ئێستا لەم بارەوە دەگوترێو دەنووسرێ دەربرینی هەستی دڵسۆزی و دەردی برینداری و خەمخۆری و ترسە لە فێڵ و تەڵەکەو ناراستی سەددامی جنایەتکار • ئەم خەڵکەی کە لە لە پێناو ئازادی و سەربەستیدا تووشی کارەسات و دەربەدەری و قر کردن و ماڵوێرانی هاتوە ، مافی رەوای خۆیەتی لە سەر مەسەلەی کوردو بارو دۆخی ئێمرۆی کوردستانی خوارو، بیروورای خۆی دەر ببرێ
من بۆ خۆم کە ئێستا لە ئوروپا دانیشتوم و دوور لە ئازارو دەرد و داخی نەتەوەکەم دەژیم و ناتوانم درکێك لە قاچی مندالە لێقەوماوێکی کورد دەر بێنم و لەتە نانێك بگەیێنمە دەستی مندالێکی برسی کورد و چۆرە ئاوێك بە زاری نەخۆشێك دابکەم و کور کوژراوێك دڵخۆشی بدەمەوە، ئیجازە بە خۆم نادەم لە دوورەوە سەبارەت بە وتو وێژی ئێستا رەخنە لە رێبەرانی بزووتنەوەی کوردستانی خواروو بگرم•
دەکرێ مرۆ لە سەر کاغەز و دوور لە مەیدانی خەبات راوی زاراوەو وشەو تیئۆری فەلسەفی بکات، بێ ئەوەی هیچ زامێکی جەستەی کورد ستانی ئێمرۆ تیمار بکا• دەبێ هیوادار بین کە رێبەرانی بەرەی کوردستان نەکەونە داوی فێڵ و تەڵەکەی سەددام و هەڵی هەڵکەوتووی

ئەمجارە بە فیرۆ نەدەن • ئەوەی لێرەدا جێگای ئیرادەو بە کەم وکوری دەزانرێ، ئاگادار نەکردنی کۆمەلانی خەلك و کزی راگەیاندن و بلاو کردنەوە و نهێنی راگرتنی چۆنیەتی و رەوەندی وتو وێژە • دیارە جارێ کلاسنۆست نەکەیوەتە نێو حیزبە کوردیەکان و تەنیا بادانەوە تەنیو- یەتەوە •

کومانم لە وەدا نیە ئەو تاقم و کەس و دەستەی ئێستا بادانەوەیان کردوتە ڕێباز و دەیانەوێ بە رابردووی خۆیاندا بچنەوە، مەبەست و ئاما نجیان خزمەت بە خەلك و نیشتمان و رزگاری نەتەوەکەیانە • بەلام بە بڕوای من نەختێك بە تالۆکەن• دەیانەوێ بە پەلە بکەنەوە ئەم قۆناخەی کە وەختێك بە جێیان هێشتبوو• هێندی جار بادانەوەکە ئەوەندە لە کور و خێرایە خۆ لە ١٨٠ دەرەجە دەدا و خوا نەخواستە مەترسی هەلدێرا- نی پێوە دیارە • وێدەچی لە بەر ئەوەشبێ تۆزی تاك کەوتبنەوە و بۆ ئەوەی بە دەردی ئەم ( رۆخە پێ پەستە ) نەچن کە دەلێ :

" ساحل افتاده کفت کرچه بی زیستم -
هیچ نه معلوم شد آه که من کیستم "

وە پەلە کەوتوون • من ئەو بادانەوانە بە هەنگاوی پیروز دەزانم• بەلام بەو شەرتەی لە کولکە نەروینەوە و بەسەر ورج دا بکەوین • ئێمە لە رابردوودا لە بۆ چوون و لێکدانەوەماندا قەت نەمانتوانیوە پارسەنگ رابکرین • یا بەلای چەپدا کەوتووین ، یا بە نشێوی راستدا خلور بو- ینەوە• بێجگە لەوە حیزب و دەستەو تاك و کۆی سیاسی کورد قەت نەبوە جارێك لە جاران بە راشکاوی و بە راستی بە رابردووی خەبات و سیاسەت و کردەوەی خۆیدا بچێتەوە، هۆیەکانی سەر نەکەوتنی هەلە نگینێ و لە سەرەدو بێژینگیان بداو بۆ خەلکیان روون کاتەوە• دوای ــ هەموو شکان و سەر نەکەوتنێك دیسان دانیان بە هەلە و چەوتیەکاندا نەناوە و یان هۆیەکی دەرەکیان کردوتە بیانووی تێ شکانیان •

بە لای منەوە هەر ئەوە پتر بوتە هۆی بروا پێ نەکردنێکی خەلك

بە ڕێبەرانی بزووتنەوە و حیزبە سیاسیەکان • لە کوردستانی خوارو جنایەتی سەددام و گازی کیمیاوی بوّتە بیانوویەکی باش بوّ نشاندانی هوّی شکانی شوّڕشێکی ئاوا گەورە و خەڵکێکی فیداکار • ئیتر گویا سیاسەتی حیزبەکان هەڵەی تێدا نەبوە و هەرچی کراوە ڕاست بوە •!

لە کوردستانی ئێران ئێستاش حیزبەکانی گورە پانی خەبات دەنووسن " ڕابردوو ڕاستی بوّچوون و سیاسەتی حیزبی ئێمەی نیشانداوە" جارێك نانووسن بە هەڵکەوت ڕەنگە تووشی هەڵەیەکیش بووبین !

زوّر زیاد نەڕوێشتووین ئەگەر بێژین یەکێك لە هوّیەکانی قەیرانی ئێستای بزوتنەوەی کورد بێ بڕوایی خەڵکە بە ڕێبەرە سیاسیەکان و ئەمەش بوّ هەر حیزب و بزووتنەوەیەك بەڵایەکی دەردە دارە •

## ئەدی بوخوت

ئێستا کە وا بە باسی یادانەوەدا هاتوومە خوار، خوێنەری ژیرو بەرێز کورج رووی پرسیارم تێدەکاو بە هەق دەپرسێ : ئەدی بوّ خوّت؟

با خوێنەری بەرێز پەلە نەکات • بە لاپەڕەکاندا بێتە خوار، تا تووشی یادانەوەی خوّشم دەبێ•

من لە دنیا بینی و بیروباوەری فەلسەفیدا ، ئەوەندەی تێگەیشتبم خوّم بە مارکسیست زانیوە • پێم وایە مارکسیزم وەك زانست ڕێگای چارە سەرکردنی مەسەلەکانی کوّمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی نیشان دەدا • لەو بڕوایە دام ئەوەی بە سەر وڵاتانی پێشووی سوسیالیستی هاتوە، خەتای پیرەوی کردن لە مارکسیزم نەبوە • بە پێچەوانە خەتای لادان لە مارکسیزم بوە • مارکسیزمیان کردوّتە ئایەتێکی وشك و برنگ و شێواندوویانە • لە کاتێکا مارکسیزم زانستە و لە گوران و بەرەو پێش چووندایە •

لام وایە مارکسیست بووم ، بوّیە بە خوێن و ڕەگ و پێست هەستم بە

بندەستی و بەشخوراوی نەتەوەکەم کردوە و بە هەموو تواناشمەوە، بە بیرو کردەوە ، بە وتە و پینوس، بە گویرەی دەرفەت و دەرەتان بـــــۆ رزگاری زەحمەتکیشانی کورد لە چەوسانەوەو زولم و زوری و بۆ ئازادی کوردستان تیکۆشاوم . لەم بیرو باوەرو ئامانجە بام نەداوەتەوەو پتەو و شیلگیر لە سەری وەستاوم .

سەبارەت بە ولاتانی ئوروپای روژ هەلات و سوڤیت کە بە سوسیا۔ لیستی ناسرا بوون و ئیستا داریان لە سەر بەردی نەماوە، بە تەواوی لایەنگریان بووم و گەلیك جاریش بە ناهەق دیفاعم لیکردوون . لـــە تەواوی ژیانی سیاسیمدا قەت ئەم بیرو باوەرەم نە شاردوتەوە. لـــە سیاست دا نانم بە نرخی روژ نەخواردوە . ئەم لایەنگریەم دەرویشانە نەبوە . نیزیکەی دوومیلیارد خەلك لەم جیهانە لایەنگری ئەم نەزمو سیستیمە بوە. بە سەدان کتیب و نووسراوەی جور بە جورم لە ســەر ئەم نیزامە خویندوتەوە. ناکوکی و خەباتی چینایەتی و کیشەی نیوان دوو سیستمی جیهانی و داگیر کردن و تالانی میللەتانی ژیر دەست و ساز کردنی شەر و چەوساندنەوەی ولاتان لە لایەن دەولەتە ئیمپریا۔ لیستەکانەوە، رووداویك نەبوە مروڤی خاوەن بیری پیشکەوتوخوازبتوا نی خوی لی دوورە پەریز رابگری. گەلیك شەخسیەتی گەورەی دنیا وەك شیخ مەحمود ، قازی محمد، نهرو ، سوکارنو ، عبدالناصر، یـــا شاعیرو نووسەری مەزن بی ئەوەی مارکسیست بووبن، لایەنگری ئەم سیستمە بوون و قازانج و مەسلەحەتی گەل و نیشتمانیان لە دوستایەتی ئەم بەرەیەدا دیوەتەوە . منیش پیم وابوە تەنیا بە یارمەتی ئـــەم ولاتانە کوردستانەکەم ئازاد و رزگار دەبی. پیم وابوە بەرژەوەنـــدی بزووتنەوەی کورد لە دوستایەتی ئەم ولاتانە دایە . لە سەر ئـــەم بوچوون و بیرو باوەرە سەرەرای دیتنی کەم و کوری و هەلویستی دوور لە بیرو باوەری سوسیالیستی ئەم ولاتانە وەدەنگ نەهاتووم و لە سەرم نە نووسیون . پیم وابوە ییکەم نووسین و وەدەنگ هاتنی کابرایەکی وەك

چ فایدەیەکی نابێ • دووەم من وەك کوردێکی نیشتمان پەروەر لــــە چوار چێوەی سیاسەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا خەباتم کردوە • حیزبی دیموکراتیش بە گوێرەی گشت سەنەدو بەلگەکانـــی دۆستایەتی و ولاتانی سۆسیالیستی بە ئەرکێکی گرنگ زانیوەو هەولیشی بۆ داوە • لە سەر ئەو باوەرەش بووم ئەرکی حیزبێکی نەتەوەیی و دیموکرات ئەوە نەبوە خۆ دەکارو باری حیزبە کومونیست و ولاتانی سوسیالیستی هەلقوتێنێ و خۆی پێوە خەریك بکا • بەشی زۆری ناکوکی نێو حیزبیم لە سەر ئەوە بوە • ئێستاش هەر لە سەر ئەو باوەرە ماوم کە حیزبێکی نەتەوەیی دیموکرات و یا کوردێکی ولات پارێز ح حەوجێ نیە خۆی بە هەلەو چەوتیەکانی ئەم ولاتانەوە ماندوو بکا ، ئەگەر بەراستی لە رێگای رزگاری ولاتەکەی دا تێبکوشێ • چونکە هەر چەندی تۆ لە سەریان بنووسی و رەخنە بگری ، نیو ئەوەندە نانووسی و نایزانی کە ئێستا خۆیان لە سەر رابردووی خۆیان دەینووسن و دەیلێن • مەگەر ئەو دەمە کە هەلوێستیان پێوەندی هەبێ بە مەسەلەی کوردەوە ، ئەو دەم ئێتر بێدەنگە لێکردن تاوانە •

تا کارەساتی هەلەبجە ئەوە هەلوێستم بوو سەبارەت بە ولاتانی بە ناو سوسیالیستی نەماو • پاش کارەساتی هەلەبجە بێدەنگیان لـــە ئاست ئەو جنایەتە سامناکە ، لە هەلوێست و بۆچوونی پێشووم بام ـ داوەتەوە و لە سەریانم نووسیوە و پێم وایە لە ئاست بیروباوەری سۆ ـ سیالیستی و ئینساندوستی و ما فپەروەری خەیانەتیان کردوە •

بەمجورە لە سەر بنەمای واقعیەت و دیتن و پراتیك ، لە بۆچوون و هەلوێستی پێشووم سەبارەت بە ولاتانی بەناو سوسیالیستی باەداوەتەوە • بەلام ئەو بادانەوەیەم بەو مانایە نیە کە لە رەخنە گرتن و دژایەتـــی کردنیاندا ، لە گەل دەزگای تەبلیغاتی ولاتانی سەرمایەداری بکەوم بـــە یەك مەتەریز و خەندەکێکەوە •

بەلام سەبارەت بە ولاتانی سەرمایەداری و دەولەتـا نـــی

ئیمپریالیستی هەڵویستم نەگۆڕاوە و بام نەداوەتەوە ٠ دژی هەموو چەشنە ملهوڕیەك و چەوسانەوەو داگیرکردن و بێدادی کۆمەڵایەتیم٠ لەسەر ئەو باوەڕەم تا لە جیهاندا شەڕو برسیەتی و نابەرامبەری و چەوسانەوەو دابەشبوونی نا عادلانەی داهات و سامانی نەتەوەیی مابێ کە خەسڵەت و ڕەوشتی سیستمی سەرمایەدارییە ، باسی دیموکراسی واقیعی و مافی مرۆڤ و داد پەروەری ، هەمووی قسەی ڕووتە و بایەخی نیە ٠ من نە زەرق و بەرقی وڵاتانی سەرمایەداری پێشکەوتوو سەرم لێ دەشێوێنێ ، نە تەنیا وڵاتانی سوید و ئەمریکاو فەرانسە و ئینگلیز و کاناداو ژاپون بە سەرمایەداری دەزانم ٠ سەرمایەداری بە تێکرایی نیزام و سیستمێکی ئابوری ــ کۆمەڵایەتیە کە ئەفریقاو ئەمریکای لاتین و هیندو پاکستان و بنگلادیژو ئێران و عەرەبستانی سعودیش دەگرێتەوە٠ لەم وڵاتە سەرمایە داریانەدا خەڵك وا لە برسان دەمرێ٠ لە هێندێ وڵاتی سەرمایەداری منداڵ فرۆشتن و سەرو دەست پەڕاندن باوە ٠ سیستمی سەرمایەداری دیاردەیەك نیە لێك جیا بکرێتەوە٠ سەروەت و سامانی وڵاتانی سەرمایەداریی پێشکەوتوو کە بەشی هەرە زۆری لە دەستی چەند کەس و شیرکەتی تایبەتیدا کۆ بوەتەوە و تا ڕادەیەکی زۆر ژیانی خەڵکی وڵاتەکەی خۆی دابین کردوە و هێندێ کەسی ساکارو لێقەوماویشی کردوەتە دەروێش ، لە لایەك بە بەرهەمی ڕەنجی شان و خەباتی چینی کرێکارو زەحمەتکێشانی ئەم وڵاتانە و، لە لایەکی تریش بە تاڵانی سەروەت و سامانی وڵاتانی دنیای سێیەم و بە چەوساندنەوەی لە ڕادە بەدەری خەڵکی ئەم وڵاتانەی دەزانم ٠

لە سەرەتای تێکۆشانی سیاسیمەوە سەبارەت بەو زوڵم و زۆریەی لە نەتەوەکەم کراوە و نیشتمانەکەم بە پیلان و دەهۆی ئیمپریالیستەکان دابەشکراوە ، لە سەر ئەم هەڵویست و بیرو باوەڕەم و نەگۆڕاوم و بام نەداوەتەوە٠ بە پێچەوانەی هێندێ کەسی بادەرەوە کە لایان وایە دوای بادانەوەی گورباچوف و مانەوەی ئەمریکا بە تاکە زلهێزی جیهان

ئیتر باسی ئیمپریالیزم و خەباتی دژی ئیمپریالیستی شتێکی زیادە و تەنانەت دەورانی ئەم وشەو زاراوانە بەسەر چوەو نووکی قەڵـەـ میشیان لێی لادەدا ، لام وایە ئیمپریالیزم لە هەر شکل و قالبێکـدا بێ، داگیر کەرەو مل هورە و دوژمنی گەلانی بن دەستەو بۆ بەرژەوەندی مونوپۆڵەکانی خاوەن سەرمایە دەست لە هیچ جنایەتێك ناگێڕێتەوە.

لە پێوەندی لە گەڵ رووداوەکانی ئەم دواییەی کوردستانی خواروودا کە مەسەلەی کوردیان لە چوار چێوەی ( مافی ئینسانی و کۆمەگی خێرـ خوازانە) دا قەتیس کرد، ناکرێ مرۆ سوپاسی بیرو راو هەڵوێستی ئینساندۆستانەی خەڵکی و وڵاتانی ئوروپا نەکات . بەلای منەوە گورمی بیرورای گشتی خەڵکی ئەم وڵاتانە بوو کە حکومەتەکانیان پاڵپێوە نا لە باری یارمەتی داو و دەرمان و خواردەمەنی و خێوەت و پاناگا هەنگاو هەڵێنن و ئارادەیەك لە فریای ئەم خەڵکە لێقەوماوە کەون. لـــەم چوار چێوەیەدا ئەوانەی یارمەتیان داوەو یا هەر وڵاتێـك بە قازانجی کورد هەنگاو هەڵێنی سوپاسی دەکەم . هەرچەند ئەم هەنگاوانـــەی ئێستای ئەم وڵاتانە قەرەبوی ئەوە ناکەنەوە کە ئەوان بوونە هۆی لەت و پەتکردنی کوردستان و ئێستاش پاراستنی حکومەتە داگیر کەرەکانی کوردستان درێژە پێدەدەن .

ئەمەش خۆی باسێکی بەر فراوانەو بە شێوەی جۆر بەجۆر لێـــك دەدرێتەوە. دیارە هەموو کەسیش بۆ دەربرینی هەڵوێست و بۆ چوونی خۆی ئازادەوە مافی رەوای خۆیەتی .

## بادانەوە لە بیر و باوەری سوسیالیستی

دوای بادانەوەی گورباچوف و رووداوەکانی ئوروپای رۆژهەلات، مەسەـ لەی سوسیالیزمیش وەك تیئوری و بیروباوەر کەوتوتە ژێر پرسیـــار و لەم بوارەشدا بادانەوە بەرچاو دەکەوێ. دیارە لە نێو ئەم حیزب وـ کەس و رێکخراوانەدا کە پێشتر بروایان بە سوسیالیزم هەبوە و خەباـ تیشیان بۆ کردوە . ئەگەر بە وردی سەیری نووسین و ئاخافتن و بـوـ

چوونی ئەو بادەرەوانە بکەین، لە سەرەتاوە (بیر کردنەوەی نوێ،پێدا چوونەوە ، شێوەی تازە ، دوور کەوتنەوە لە وشکە رویی و لاسا کردنەوە) دروشمیان بوو. بەڵام بە تێپەر بوونی زەمان و سەرهەڵدانی رووداوە- کانی ئوروپای روژ هەلات و سەرکەوتنی ئیمپریالیزمی ئەمریکا لـــە شەری خەلیج و مانەوەی بە تاکە زلهێزی جیهان،ئیتر وردە وردە نەفی تەواوی سوسیالیزم و بیرو باوەرەکەی لە بۆچوون و لێکدانەوەیانـدا خۆ دەنوێنێ. ئەم نەخۆشیە لە نێو چەپی ئیراندا لە هەموو شوێنێ بـــە هێزترە .

بە بروای من سوسیالیزم وەك زانست کە رێنوێنی هەڵدان و پێگـە- یشتنی مروڤایەتیە وئامانجی ئازادی و بەختەوەری ئینسان و نە هێشتنـی چەوسانەوە و نابەرامبەری یە، هیچ پێوەندی بە چین و سوڤیت و فلان و فیسار ولاتەوە نیە . بیرو باوەرێکی زانستیە کە رێبازی هێزە پێشکە وتخوازەکان بۆ گەیشتن بە ئازادی و یەکسانی و دیموکراســـی دیاری دەکات . چەوسانەوەی مروڤ بە دەستی مروڤ کۆتایی پێ دێنێ.
کەوابوو نە لەمبەریەك هەلتەکانی (سوسیالیزمی واقیعەن مەوجود) ونە رووداوەکانی ئوروپای روژ هەلات و سوڤیت وام لێ ناکەن کە لە بیرو- باوەری سوسیالیزمی زانستی بادەمەوە . چونکە پێم وایە رەسەنترین هێزی تەکاندەری پێشەوە چوونی مرووایەتیە بۆ گەیشتن بە ئازادی و دیموکراسی و دادپەروەری . ئەمە لە باری بیرو باوەر و ئیدیولوژییەوە بەلام لە باری پراتیك و خەبات و تێکوشانی روژانەوە، بۆ ئێمەی کوردی لێقەوماو وبەشخوراو، هەولدان بۆ رزگاری لە ژێر دەستی و دوزینەوەی باشترین رێگەی خەبات و گەیشتن بە ئاوات، لام وایە ئەرکی هەمـــوو لایەکمانە . خۆ بە خەلکیەوە ماندو کردن دەردێکمان دەوا ناکات.

مەسەلەیەکی تر کە لێم بادراوەتەوەو بروام پێ نەماوە ، ئینترنا- سیونالیزمە بە هەموو ماناو تەعبیرێکیەوە . لام وایە ئەم وشەیە تەنیا راوی سەر کاغەز بوە و بە کردەوەلە چوار چێوەی بەرژەوەند و

مەسڵەحەتی تایبەتیدا بوە • حیزبە کومونیستەکانی دنیای سێیەم و چەپی کورد پتر لە هەموو کەس بەم پەت و داوە بەستراونەوە و بەرژەوەندی وڵات و میللەتی خۆیان فیدای ئەم وشە قەبەو قەڵەوە کردوە •

لەو هەموو بادانەوە و بانەدانەوە دا بە سەر مەسەلەی (کوردستانی بوون و کوردستانێیەت ) دا کەوتووم و ناشتوانم خۆی لێ لادەم • ئەم وشەو دروشم و زاراوەیە ، لەم دەربەدەری و بێ دەرەتانیەدا پتر لە هەمو کات و زەمانێك هاتوتە سەر زاران و خۆی پێوە رادەنێن •

جێگای شوکرو پێ خۆشبوونە کە تێکۆشەرانی کورد، دوور لە مەیدانی خەبات و تێکۆشان ، لە هەوای فێنك و ئازادی ئوروپادا بستێك لە سەربەخۆیی نایەنە خوارو بەناوی کوردستانیەت و یەکبوونی خاك و نەتەوە لە هەوڵ و تێکۆشاندان • جاری واش هەیە هەموو شێوەیەکی دیکەی خەبات بۆ چارەسەرکاتی و یا سەنگ و سوکی بۆ کەمکردنەوەی ئازارو و ژان و دەرد، یا باسی خودموختاری و ئەم بەیت و بارە بە خەیانەت ناو دەبەن • ئەم هەڵمەت و هەوڵ و تەقەلایە شیعری شاعیری میللی کورد **فایق بێکەس** وەبیر دەخاتەوە کە دەڵێ :

" قەومیوا نامرێ ئەژی، دوژمنی با شەق بەرێ مەتین•
ساحیبی روڵەی نەبەردە ، خاوەنی عەزمی

ئەمما ، بۆ خۆم • ئەزموونی خەباتی پتر لە چل ساڵم ، ئاشنایەتی و ناسیاری و ئاخافتن و هاوکاریم لە گەڵ برا کوردەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان، سیاسەت و هەڵوێست و کردەوەی حیزب و هێزە کوردستانیەکان، گەیاندومیە ئەو قەناعەتە کە وشەو زاراوەی (کوردستانیەت و کوردستانی) بوونیش هەر شتێکە وەك (ئینترناسیونالیزمەکە)•

یەك لە ئەزموونی ئالو گۆری جیهان و سەردەمی تێکنولوژی و پریسترۆیکا ئەوەیە کە مرۆڤی تێکۆشەرو خەباتگێر، چالاکی خۆی لە گەڵ واقع رێك بخاو لە زیانی بە خەیاڵ و ئاوات و ویست خۆی دوور خاتەوە•

واقیعی کوردستان چیه ؟ واقعیەتی تاڵ و داخداری کوردستان ئەوەیە کە ئەم نیشتمانەی ئێمە بە پێچەوانەی ویست وئاواتی نەتەوەی کورد، بە دەستی زۆرداران دابەشکراوە و کوردەکەش بە زێدو نیشتمانەوە لێك جیا کراوەتەوە. دیارە هیچ کوردێکی نیشتمانپەروەر دان بەم سنوورە دەستکردەدا ناهێنێ و کوردستان بە یەکپارچەو کورد بە یەك نەتەوە دەزانێ. بەڵام ئەوە هیچ لەم واقعیەتە ناگۆرێ کە نەتەوەی کورد لە پرۆسەی ئەم دابەشکردنەدا ، لێك دابراوە . بە ناچاری وەگری کولتور و داب و رەسمی فارس و تورك و عەرەب بووە . لە زۆر شت لە فەرهەنگ و زمان و دابی نەتەوەی بالادەست نیزیکترە تا هی کوردەکە خۆی .

ئەم دابەشکردنە و ئەم سنوور داتاشینە، بمانەوی و نەمانەوی کاری کردۆتە سەر سیاسەت و خەباتی رزگاریخوازی کورد. هەر حیزب و رێکخراوێکی کوردی لە هەر بەشەی کوردستان بە گوێرەی مەسلەحەت و بەرژەوەندی بە شە کوردستانەکەی خۆی ، یا ئەگەر پچووکتری بکەینەوە، بە گوێرەی مەسلەحەت و بەرژەوەندی حیزب و گروپ و داروەدەستەکەی خۆی دەجولێتەوە . نموونەی بەرچاوی حاشا لێ نەکراو زۆرن.

برایانی کوردی کوردستانی خواروو ، سیاسەت و بەرژەوەندی وڵاتی خۆیان هەیە . سالەهای ساڵە لە خەبات و تێکۆشاندان . قوربانیان داوە لە هەموو کەس پتر شارەزای وڵات و کارو باری خۆیانن . قەت بەرژەوەندی گەل و نیشتمانی خۆیان فیدای مەسلەحەتی بە شەکانی تری کوردستان ناکەن . برا کوردەکانی کوردستانی ئیران و تورکیاو سوریاش هەر ئەم سیاسەتیان هەیە و گیرو گرفت و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان هەیە . مافی رەوای خۆشیانە کە مەسلەحەتی خۆیان لە بەر چاو بگرن .

جا بەم حالە و بە لە بەر چاو گرتنی ئەم واقعیەتە، ئەگەر کەسێکی وەك من لە دوورەوە خۆ بکاتە دمراست و رێنوێنی برا کوردەکانی غەیری وڵاتەکەی خۆی ، ئەوە تەنیا خۆ ماندوو کردنی پێ دەمێنێ و -

هیچی تر • جا مەگەر هەر بۆیە بێ کە بڵێ منیش هەم !!!

رەنگە دەربرینی ئەم راستیەبۆ نیشتمانپەروەرانی کورد، تۆزێ لە شانان گرانبێ • بەلام قەیناکا، با بەراشکاوی نەختێ پتری روون ــ کەینەوە • ئێمەی کورد هەر حیزب و هەر کەس و هەر بەشەی کوردستان بۆ راپەراندنی کارو باری خەبات و یا بە قەولی هێندێکان (شورش) زۆر جار پاڵ وە دوژمنێکی میللەتەکەمان دەدەین کە بە سەربەشێکی نیشتمانەکەماندا زاڵەو لە کوشتار و خنکاندنی میللەتەکەمان دەست ناکێ ێتەوە • جاری وا هەبوە بۆ دڵنیایی دوژمن و بۆ خۆ شیرین کردن کوردی بەشەکەی تری نیشتمانمان کوشتوە و یا دژی بزووتنەوەی ئەوان لەگەڵ دوژمن هاوکاریمان کردوە • ئیتر بەم حاڵە (کوردستانیەت) راستی وشەو ناوەرۆکی چی بە سەر دێت ؟•

باشە ••• خۆ کەس لە پاسوك (حیزبی سوسیالیستی کورد) کورد ـ ستانیتر نیە • بەلام ئەویش بەر لە هەموو شت بەرژەوەندی حیزبە ـ کەی خۆی لە بەر چاوە • ئەوەنیە حکومەتی ئیسلامی ئیران بەشێکی کوردستانەکەی کردوتە زیندانی نەتەوەکەی و بە هەزاران لاوی کوردی بێ تاوانی هەر بە تاوانی کوردایەتی گوللە باران کردوە، بەلام هێزە کوردستانیەکانی عیراق کە لە کوردایەتیدا هیچ کەسیان ناگاتێ بە پاسۆکیشەوە لە پەنایدا دەژین و دژی سیاسەتی کورد کوژی ئەم دوژمنە و ئەم رێژیمە ئیسلامیە زمانیان ناگەرێ•

ئەوەنیە سەددامی خوێنخور پێنج هەزار کورد بە بومبای کیمیایی قردەکاو سەرتاپای بەشێکی نیشتمانی کورد وێران و خاپور دەکاو بە میلیون کورد لە نیشتمانی خۆی دەگوێزێتەوە ، بەلام هێزە کوردیەکانی کوردستانی ئیرانیە (رێبەرە مەزهەبیەکەشیانەوە) دەنگیان لە بەر نایە تە دەر و لە سەر وێرانیەکانی بەشێکی نیشتمانەکەیان، بۆ رزگاری بەشەکەی تر خەبات دەکەن• دیفاع لە خەڵکی فەلەستین و نیکاراگوا و

ئەفریقای رەش لە سەر لاپەری رۆژنامەکانیاندا دەدرەوشێتەوە.
ئەوەنیە ریژیمی حافیز ئەسەدی (ئانتی سەهیونی و دوستی سوسیا لیزم) تەنانەت مافی هاو ولاتیش بە کوردەکان رەوا نابینی، بەلام کوردە سەر بەخۆیی خوازەکانی تورکیا و برا کوردەکانی عیراق لە ژێر سێبەری ئەم زاتەدا بۆ رزگاری و سەربەخۆیی کورد خەبات دەکەن ئەوە نیە کوردی سوریا سەبارەت بە پێشکەوتنخوازیان لە پێناو ئازادی فەلەستین دا ، بە دەستی جولەکە خۆ بە کوشت دەدەن.
نووسینی ئەم واقعیەتانە رەنگە لە کەکرەی تالتر بێ و بە دلی زۆر کەسیش نەبێ. بەلام ئاوایەو نکولی لێ ناکرێ. گومانم لە وەدا نیە کە هیچ یەك لە هێزە کوردستانیەکان ئەم وەزعەیان بە دل نیە . بەلام لەم شێوە خەبات و تێکۆشانەدا بە سەریاندا سەپاوە و چاریان نیە با هەزار شێرو رێویشی بۆ بێننەوە ، بەلام هیچ گۆرانێك لە راستی مەسەلەکەو لە واقعیەت دا پێك ناهێنێ.
بە لە بەر چاو گرتنی ئەم کارەسات و رووداوانە و بە ئەزموونی ژیانی رابردووم گەیشتوومە ئەو قەناعەتە کە (کوردستانیەتی) ئێمەش هەر شتێکی وەك (ئینترناسیونالیزمەکەیە ) کە لێم باداوەتەوە .
یا شتێکی وەك ( امة العربیة واحدة ) ی عەرەبانە کە شەو وروژ کردو یانەتە بنێشتە خۆشکە و ئاکام و بەرهەمیشی دیارەو بۆ باسکردن نابێ.
بۆ هەر باسی هێزە سیاسیەکان بکەین . ئەم هەموو گۆڤار و رۆژنا- مە لە ئورووپاو یا لە کوردستان لە لایەن هێز و ئەدیب و نووسەرە کوردە- کانی کوردستانی خوارو و تورکیا بلاو دەبنەوە .بزانین یەك وتاریان لە سەر کوردستانی ئیران و دژی حکومەتی ئیسلامی ئیران تێدایە ؟
ئەم نووسین و بۆچوونەم بەو مانایە نیە کە لە ئاست یەکبوونی کورد- ستان و یەك رەگەزی کورد گومان و دردونگیم لێ پەیدا بووبێ. مەبە- ست ئەوەیە بەخۆدا بچمەوە و لە هەلگرتنی درۆشمی قەبە و لە زاران خۆشیدلفێنك کەرەوە خۆ بپارێزم. چونکە لە ژیانمدا نەمویستوە قەت

کوردایەتی بکەمە بازار و خۆی پێوە رابنێم •
لەم بوارەدا بێ لایەن و دەستە وستانیش نیم • رەنگە لە نوسین وباسی ئەو مەسەلەیەدا لە خەڵکی تر بە جێ نەمابم • بەڵامئەوە نیە بادانە وەو پێداچوونەوە بوّتە باو و خەڵك ئاور لە رابردووی خوّی دەداتەوە•
بە بروای من پاش کارەساتی کوردستانی خواروو، دوای ئەنجامی گەمەی دەوڵەتانی روّژئاوا تەواو بوونی ئەم شانوّیەی خەڵکی سەر گەرم کردبوو، تێکوّشەرانی رێگای ئازادی و دیموکراسی لە کوردستان پێویستە خەباتی خوّیان لە گەڵ هەل و مەرجی تازە پێکهاتووی دنیا رێك بخەن • ئەویش لە سەر ئەم سێ ئەسڵەی خوارەوە :
یێکەم هەموو حیزب و دەستەو گروّ و کەسانی تێکوّشەر بە شێوەیەکی دیموکراسی و برایانەو رێزگرتن لە بیرو رای یەکتر لەم بە شە کوردستانەی کە تێیدا دەژین لێك کوّ ببنەوە و شێوەیەکی نوێی خەبات بدوّزنەوەو ستراتیژیەکی نوێی دنیا پەسند بوّ تێکوّشانی خوّیان دابرێژن • بێ ئەوەی خوّ لە کارو بارو سیاسەتی بەشەکانی تری کوردستان تێ هەڵقوتێنن •
دووەم ـ ئەم ستراتیژیە بە بروای من بریتیە لە خەبات بوّ پێکهێنانی دەرفەت و دەرەتان بوّ ریفراندوّم و دەنگدانی گشتی کە خەڵکی کورد بتوانێ بە ئازادی و سەربەستی بوّ دیاری کردنی ژیان و کەیانی سیاسی و ئابوری و کوّمەڵایەتی خوّی دەنگ بداو چارەنووسی خوّی بوّ خوّی دیاری بکات • بوّ ئەم مەبەستەش لە بیرورای گشتی خەڵکی ئوروپا کەلك وەربگیرێ و لەم رێگایەوە کوّمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکان بخرێتە ژێر فشار بوّ ئەوەی ریفراندوّمیکی ئەوتوّ بوّخەڵکی کورد ساز بکا و دەستەبەری پیادەکردن و سەپاندنی نەتیجەی دەنگدانە گشتیەکەش بێ•
لام وایە کاتی ئەوە نەماوە کە حیزبێك، گروپێك و یا کەسێك خوّ بە خوێنەرو رێبەر و دەمراستی چەند میلیون خەڵك دابنێ و لە جیاتی ئەوان دروشم•لافیتەی جوّر بە جوّر بەرز کاتەوە وخود موختاری و سەر

به خۆیی و فیدراڵی و چی و چی یان بۆ دیاری بکا.
سێیەم لە پێوەندی لە گەڵ (کوردستانیەت) و بەشەکانی تری کورد ستان، دۆستایەتی ، هاودەردی ، گۆرینەوەی بیرورا ، یارمەتی دان بە گوێرەی توانا بی ئەوەی دەست بخەنە نێو کاروباریان،بکاتە سیاسەتی کوردایەتی و ریبازی خوی .
هیوادارم خوێنەری بەرێز ئەم بۆچوونەم بە نسحەت و رێنوێنی نەزانێ. خۆتان دەزانن ئێستا ئێمە لە دێموکراسی دا دەژین. ئەدی دێموکراسی هەر ئەوە نیە هەر چی دەتەوێ بینووسی و دەری ببری ؟!
وتارە رەق و بابەتی و دڵسۆزانەکەم بەم شیعرەی نیشتمانپەروەری کورد، ماموستای شاعیرانی موکریان، جەنابی ئەبولحەسەنی سەیفی قازی (سەیف القضاة) کۆتایی پێ دێنم کە دەڵێ :

**هەر چی دەبێ ، بلا ببێ، هەق هەر هەقە حەسەن**
**نینە لە رێی وەتەن ، خەمی دەر کردن و جنێو.**

١٥/ ٨/ ١٩٩١

## تی هەلکیش

لە نووسینی ئەم باسە ببوومەوە و هێشتا نەمناردبوو کە چاپ بکرێ و بە دەردی کتێبەکەی دیکەم بچێ ، رۆژی ۹۹۱/۸/۱۹ دیویکی دیکەی بادانەوەی گۆرباچۆف کەوتە روو. کەمی مابوو بە دەردی سادات بچیو سەری لە سەر دانێ. بەلام دیار بوو بادانەوە لە ماوەی ئەم پێنج سالەدا هەر چەند نەیتوانیبوو لە بواری ئابووری و ژیان و بەرێچوونی خەلکەوە ئالوگۆڕێکی باش پێك بێنێ ، بەلام لە بواری ئازادی نوسین و دەربرینەوە هەنگاوی گەورەی هاویشتبوو. لە م بوارەدا پریسترۆیکا چیژەیەکی خستبوە بن دان و زمانی خەلك و ترسیان لەوە شکابوو کە نەوێرن دەنگ دەر ببرن. ئەوەبوو ، کاتێك خەبەری کودیتا و بادانەوەی دیکەیان بیست ، هاتنە مەیدان و لە بەرامبەر تانگ و کوماندوی چەکدار وەستان و کودیتای دیکتاتۆریان تێك شکاند، تا دیموکراسی لە ولاتدا بەردەوام بێ. بە زمانیکی تر، دیکتاتوری پرولتاریایان رووخاند ، تا دیکتاتوری دیموکرات و دیموکراتخوازەکان دابمەزرێنن.

دیار بوو بادانەوەی ئەمجارە کەلێك توند بوو. سنووری ساوە ساوی بادانەوەی گۆرباچۆفی پەراند و بە خێرایی ۱۸۰ دەرمجە وەر سووراو بە دیموکراسیەوە خۆی نەگرتەوە و بە لای دیکتاتوری نوێدا کەوت. وادیارە ئەو میللەتانەی لە چوار چێوەی ولاتی سۆفێت دا دەژین ، یا بە گشتی خەلکی ولاتانی دوا کەوتوو، دیموکراسی یان پێوە نایە و بە بێ دیکتاتوری ژیانیان تالە. !

زور سەیرە ئەوانەی چەندین سالە گویا لە چنگ دیکتاتوری نالە-یان هاتوە و خۆشیان بەك لە تاکی دەزگای دیکتاتوری بوون و دوای بادانەوەی گورباچوف وشەی دیموکراسی و ئازادیان کردۆتە بنێشتە

خۆشکە و لیکاوی جاوینی مافی مرۆف و دیموکراسیان بە لالغاواندا ـ دەهاتە خوار، بە ناوی پاراستنی (دیموکراسی) ومەحکوم کردنی ـ کردەوەی غەیرە قانوونی و چەپەڵی کودیتا چیان ، بەلای دیکتاتۆریدا بایانداوە و بە فەرمانی قەدەخە کردنی حیزبی کومونیست، رووی هەمو دیکتاتۆرەکانی سەر دەمیان سپی کردەوە . بادانەوە کاتێك گەیشتە خلیسکان، خۆ گرتنەوەی دژوارە . گۆرباچوف و ییلتسن خلیسکان و ـ رەنگە بە دەست تیوەرهێنانی داری ئیعدامی کومونیستەکان خۆ بگرـ نەوە. ئەوانەی خۆیان لە بەریوە بەرانی سیستمی دیکتاتوری بوون، واـ دیارە بە بێ دیکتاتوری ناتوانن ریبەرایەتی بکەن . بۆ ئەوەی دیکتاـ تۆری حیزبی بە دیکتاتوری تاقەکەسە و یا چەند کەسێك بگۆرنەوە،ئەشێ حیزبێکی ٩٠ساڵەی کومونیستی بەبێ دادگایی کردن قەدەخە بکەن و بنکەو بارگاو ئیدارەکانی مۆر بکەن و رۆژنامە و ئورگانەکانی دابخەن و لەو ریگایەوە دیموکراسی دامەزرینن . زۆر سەیرەئەوانەی بە لاسا کردنەوەی سەرمایەداری رۆژئاوا دەیانەوێ بۆ وەرگرتنی یارمەتی خۆ شیرین بکەن ، بە دابو رەسمی ئەوانیشەوە ناوەستن . ئەوەتا لە هەموو وڵاتانی سەرمایەداری پێشکەوتوودا ، حیزبە کومونیستەکان ئازادن. ئیتر ئەگەر هەر ناوێکی بێ ناوەرۆکیان هەیە، ئەوە مەسەلەـ یەکی دیکەیەو خەتای خۆیانە . ئەو مەسەلە جوانەی کوردی لەو دیموکراسی خوازانە وەراست گەراوە کە دەڵێن : " ئاغایەك بە نوکەرە کەی گوت : داجلی ئەم تاژیەم راستکە . نوکەر جلەکەی دەبەر زگی دەخست " لێرەدا مەبەست دیفاع لە حیزبی کومونیست نیە کە پاش ٧٠ ساڵ دەسەڵات نەك هەر نەیتوانیوە وڵات لە دواکەوتوویی رزگار بکا ، بەڵکوو تووشی قەیرانێکی نەدیتراویشی کردوە . هەی گۆر . یا دیفاع لەو کومیتە ناوەندیە نیە کە ساڵەهای ساڵ بە ناهەق خۆـ یان بە سەر چارەنووسی خەڵکدا سەپاندوە و بە فەرمانێکی ییلتسن وەك کیسەل سەریان بردۆتەوە دە قاپیلکی خۆیان . تەنیا مەبەست لێ ورد

بوونەوەی شێوەی پیادەکردنی دیموکراسی گورباچوف - یێلتسنە ·
خلیسکانی یێلتسن دوور نیە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ناچار بکا لە راپۆرتی ساڵانەی خۆیدا لە سەر پێشێلکردنی مافی مروٚڤ لە سوٚڤێت وەدەنگبێ !

یان ڕێکخراوی لێخۆشبوونی گشتی (ئەمنێستی) و لیژنەکانی پاراستنی مافی مروٚڤ لە سەر راونان و ئازارو ئەشکنجەی کومونیستەکانی سوٚڤێت بە یان بـ‌ـزو بکەنەوە · ئەومنیە ئەوان (بەرگری لە مافی مروٚڤ) دەکەن · !

ئەگەر ئەوانیش [illegible] ناکرێ بە دووری بزانین کە (تواریش) - یێلتسن گەلاڵەیەك بدا بە کوٚمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکان کە [illegible]نەوەی کومونیستی بە تاوانی هەڵسورانی دژی ئینسانی و دژی ئایینی و دژی دیموکراسی و دژی نیشتمانی لە دنیادا مەحکوم بکرێ · رەنگە ناهەقیش نەبێ، چونکە کابرا بوٚ دیموکراسی تێدەکوٚشێ و (لایەنگرانی دیموکراسی و پارێزەرانی مافی مروٚڤ) یش دەستخۆشانەی پێ دەڵێن و یارمەتیشی پێدەکەن !

ئاوایە بەرهەمی بادانەوە کاتێك بکاتە خلیسکان و سور خواردنی ۱۸۰ دەرەجەیی !!



مام جـەلال

" جەلال تالەبانی کە ٢٦ی مانگی مارس بۆ کوردستان گەرایەوە، لە زاخۆ هەزاران کوردی چەکدار پیشوازیان لێکرد. ناو براو لە کاتێکا چاوی پر بوون لە فرمێسک ، لە هەیوانی مالێکی دەستی بۆ خەلك رادەوەشاند و بە بۆنەی سەرکەوتنی پارتیزانەکانی کورد بە سەر (دیکتاتۆری بەغدادا) پیروز بایی لێکردن و گوتی :

-" شەر تا ئازاد کردنی هەموو عیراق درێژەی دەبێ .

جەلال تالەبانی بە لایەنگرەکانی خۆی گوت : " ئێمە دەتوانین لە دوا رۆژی عیراقدا نەخشێکی گرنگمان هەبێ. چونکە ١٣ سال ئەزمونی شەرمان هە یە و دەتوانین لە ناوچە ئازاد کراوەکان بەرگری بکەین .

"رۆژنامەی ئیران تایمز : ٢٩ی مارسی ١٩٩١"



چەکی شۆڕشگێرانی کوردە لە چیا کەوتۆتە سەر یەک
مێژوو تیکرار بۆتەوە



لێقەوماوانی کورد بەرەو ئێران



لـە سنـووری ئـیران پاسدار رایانگـرتـوون —



تـۆ بڵێی ئـەم منداڵـە ئەم رۆژەی لـــە بـیر بچـێ ؟



بێ دەسەڵات بیر لە دواڕۆژی نادیار دەکەنەوە



بۆ قۆزتنەوەی نانێک لە حەوا ئەم دەستانە بەرەو ئاسمان چوون



برسی و دەربەدەر ٠ لەسەر چی ؟



دایـــه پیـێره لـــه چـــی راماوه ؟





ئەم گوڵە تازە پشکوتوەی کــورد تــاوانـــی چـــیە ؟



بـــۆ دواڕۆژ کار کـوشـتـه‌تـــر ده‌بـــێ



یەك لەو سەدان منداڵەیە کەقەت گڵکۆی نا دۆزرێتەوە



کوردە موسڵمانەکە لەم وەزعەشدا تەسبیحاتی خۆی هەر دەکات !



ئـەو منـداڵــە برینــدارە بــۆ کـوێ دەرباز دەکا؟



کەڵەکەیە بوونان ، هاوار بە ماڵم !



بێ پەناو بێ دەرەتان لە چیا



کـی بـەر پـرسـی دەربـەدەری ئـەم هـەمـوو ژن و مـنـدالـّـە یـە